**لە نێو شەپۆلی خەیاڵتان لە چوار مێخەم دەن .**

**من گوناهبارتر و خەفەتبارترم لە مانگ .**

**لە نێو چیمەنی پێکەنینە کریستاڵییەکانتان لە ئامێزم بگرن .**

**من سەرەداوی ڕێگای گۆڕستانیترین و تەنیاییترین**

**حەقیقەتە نێژراوەکانتان پێ دەبەخشم .**

**مەمکی جوانییە پشکۆیە ئەڤینییەکان / دەنەخشێنن**

**سەپکانەترین هەوارگەکانی بیرکردنەوەم .**

**ئەی میهرەبانترین دڵە گەورەکانی عەشق .**

**لەم تەمستانە شەوانەییەم .**

**چاوەکانم ماندووی گەمەی وردیلەترین خەونە گیاییەکانە**

**باڵام کڵپەیەکە لە هەناسەی سەحەرە بژوێنییەکان**

**ماندووم بە سەحەرم کەن ....!**

**مەستانەترین دەروێشی بە ڕەها بوونی ڕەهەندە بازنەییەکانتانم**

**حەزە فەرامۆشکراوەکان , بزەی باڵندەیەکی دڵشکاو بوون .**

**لە بیرەوەرییەکانی تەمەنێکی پڕ لە پشکۆ.**

**ئەو ڕۆژگارانەی ماچمان بە ڕووبار دەبەخشی و سەمامان**

**بۆ هەور دەکرد .**

**ڕۆژگارە ئاوریشمییەکانی دڵ و گیان بوون .**

ئەمێستا ,

یادگارییە شەپۆلاوییەکانم بە ئاوی گوڵ دەنووسمەوە

بوونم قەسیدەیەکی غەریبە پڕاو پڕە  لە حەزە ئەفسوونییەکانی

نێو دارستانێکی غوربەتی .

ئەمێستا , لاپەڕە خەزانییەکانی بەهار بە پەیژە سەرابییەکان هەڵدەواسم .

دادەگیرسێنمەوە چرایە بۆ ناز کەوتووەکانی لێوی شەو .

لە نێو رەحمی ئەم ئاشووبە حەژمەتیە / لانەوازترم لە بەفر

چ ئازارێکە , کەژاوە خەمۆکییەکانی لێك دابڕان .

من ئەرشیفێك لە گوڵ و دارەبازەیەك لە بووکە شووشەو

گوڵدانێك لە خۆشەویستیم بەجێ هێشتووە .

ماڵئاوایی / کەرنەڤاڵێك لە شێت بوون .

جێ ژووانگە تەنیاییەکان / سەمفۆنیایەکن لە مەرگ , بزەیەکن لە گریان .

ئەی سەرگەردانەترین باڵ لاولاوەییەکان .. بە بارانم کەن .

تا گڕ بەر بدەم لە مەمکۆڵەکانی ئەڤینیم . لە پەنجە ئەستێرەییەکانم .

با رۆشن بکەمەوە پەنا و پەسیوە تاریکەکانی عەشقگەکانتان

دەمەوێ لێوی  ساتە شەرمنۆکییەکانی نامۆ بوونی خۆشم تەڕبکەمەوە .

با پێکەوە بشکێنین .. قۆزاخە شووشەبەندیە بۆ پەنجەرەکان .

با موچڕکەکانی عەشق لە گەڵ خوێنی برینی پەنجە و دڵمان

**تێکەڵ بەو بارانە بێت / کە بە هۆیەوە خۆمان دەدەینە بەر تاڤگە**

**ڕەهاییەکانی توانەوە .**

**لێرەش لە ناو سەدەفێکی فڕێدراوی نێو بیابانێکی بێ گیا و گوڵم**

**وێڵم بە دوای نافوورەیەك لە عەشق و خۆرەتاوی بەختەوەری .**

**وێڵم بە دوای شکۆفەیەك لە نازە سنەوبەرییەکانی باخچەی خەیاڵ**

**لێرەش ئەو باڵا وردیلە و بزاوتە جوانە ڤینۆسیانە لە باوەش دەگرم**

**کە گەڵا تامەزرۆییەکانی گوڵاڵە شەرابیەکان .**

**بە نەرمەبای ئێوارە هەنارییەکان لە سەر سینەیان دەگەشێنەوە**

**ئەو باڵا وردیلە و بزاوتە ئەسمەرییە ڤینۆسیانەی**

**کە مەمکۆڵەی پەریزادە ئاوێنەییەکانی فیردەوسی ماچ دەکەن.**

**ئەوا هاتم .. خەونەکانی رووبار هەڵیان گرتووم .**

**لە ناو بەلەمێکی ئەڵماسیم سەوڵ لە شەپۆلەکانی خەم دەدەم.**

**ئەوا هاتم خۆم و چاوە خەواڵووەکانی شەقامە گڕ گرتووەکانم ,**

**خۆم و هەوارگەیەك لە نهێنییەکانی عەشقە باڵندەییەکانم**

**خۆم و هەگبە مانگە شەویە ڕووناهییە سیحراوییەکانم**

**کە هیڤیدارترین و بە تاسەترین کۆرپە خۆزگەییەکانم رادەژەنن.**

**ماندووم بە شەونمم کەن .**

**با بسرەوم لە سەر گەڵا سەوزەکانی دوا مەنزڵگەی**

**گۆرانییە ئارامییە ئەبەدییە ئاوییەکانی ئومێدم .**

**کە پەرداخێکە , پڕاو پڕە لەو شەرابەی لەزەتی خۆشەویستی و**

**ئەوینە گولاڵەییەکانم پێ دەبەخشن .**

**من پێکهاتەیەکم لە غوربەتیترین باخچەکانی شەو**

**ئارەزوومە لە نێو خولیاترین پەیامی مامە خەمەیی خەمانی خۆم**

**چۆلەوانییەکانی سەر روخسارتان ئاوەدان بکەمەوە .**

**لە دەروازەی گەردانە سپییەکانی نیشتەجێ بوون**

**لە رووبار رووبارتر و لە باران بارانتر بم .**

**ئارەزوومە کەژاوەیەك لە ماچی عەشقی شێتانەشم**

**بۆ پێدەشتی گۆنا گەنمیە گوڵە نێرگزییەکانتان / بنێرمەوە.**

**تورکیا 1998**

# طةلآ ووريةكا تةمةن

– 1 –

**با بێگەردتر بڕوانین**

**بێ گەردتر / لە شیرین خەوە خامۆشییەکانمان**

**ئەسمەرتر لە سەمای ڕوانینەکانمان ..**

**زەردەخەنە مەست بووەکانیش**

**حیکایەتمان بۆ دەگێڕنەوە .**

**ئێمە بەم هەموو مەراقە خۆکوژییەوە ,**

به ڕێگا باریك باریكەكانی خەیاڵ و

به نێو گەلەرییەكانی گومانەوە هاتووین

نەرمتر / لە گریانە بارێزەییەكانی مەرگ و بێ دەنگتر لە

گلۆرەبەنەكانی

بەرائەتمان ,

وردە ئێسقانە سپییەكانی "با" و وەرزێك لە مەمكۆڵە

تریفەییە

پاكیزەییەكانی بارانمان كۆ كردەوە .

ئەوە چی بوو ...؟!

هەر لە ئەزەلەوە / لە ڕوانینە پێشەنگییە ناسكە سێلاوییەكانمان

ئۆقیانووسێك لە ڕازە بەرخۆڵەییەكان و سەدەیەك لە پایزە گەڵا

بێ نازەكانمان .. هەڵوەراند .

هەڵوەری گەڵا بخوورییەكانی تەمەن / هەڵوەری هەڵوەری .

دیسان ئۆپەرێتێك لە سەفەری گریان و گریانێك لە ئۆپەرێتی سەفەر

گەردنی چیمەنە سپییە قەدیفاوییەكانی نێو ڕەنگەكانمان ماچ دەكەن

ئەو چیمەنەی لە نێو دۆزەخ و ڕەشەبا

پشكۆی ئاونگە زەردەخەنەییەكانی لێ دەچۆڕا .

هەر لەئەزەلەوە ئاگرمان لە مەمكۆڵە فەریكەییەكانی عەشق بەردا

**باخچەمان کردە جێ مەزارگەی  فریشتە و پەرییان**

**داستانێك لەگوناهمان خستە نێوجەستەی قەقنەسە شینەکانی دەریا**

**مردنەکانمان لە چەشنی پێکەنینەکانی ئاو هەموو دەم دووبارە دەبنەوە**

**دەبا پاساریتر / لە نێو جۆگەلەکانی "با " رابکشێین**

**بەڵکو دەستمان لە مەمکۆڵە لماوییەکانی هەور گیر دەبێ**

**خەونە ئێسقاناوییەکانمان لە سەر گۆنای گژوگیا بەجێ هێشت.**

**دەبڕۆننێ .. ئەمە چ گەمەیەکی خۆکوشتنە !**

**هەر لەئەزەلەوە ماسکە خۆڵاوییەکان خۆیان لە ناسکە گوڵاڵەکانی**

**ئەم هاتنەمان ئاڵاندووە .**

**تریفە شەرمنۆکەکانی ئەگریجەی شەوگارمان بە کوشت دا .**

**لەنێو ئاوێنە شەپۆلاوییەکانی  ئاو سێبەرەکانی خۆمان نابینین**

**هەر بە پێکەنینەوە بەرەو پیری مەرگ رۆیشتین /**

**دوور دوور  رۆیشتین**

**شەوگارستانێك لە نێو خەیاڵ و ئەشکەوتێك لە ناو جەستەمان**

**دەسوورپێنەوە**

**ئەوە چی بوو ...؟!**

**هەڵوەری گەڵا لاولاوەییە  هەمیشە بەهارییە ئێوارە**

-2 -

دەبڕۆننێ .../

لە نێو هەناسەکانمدا چ نەسیمێك لە پۆرترێتە نەسیمە

خەماوییەکانی

ئێوە نەسیمترە .

بە جێم هێشتوون / نەمدەزانی دەبن بە باران و لێم جیا نابنەوە

دەی دەبا ناسکۆڵەتر بڕوانین

با لەو پەیڤە غوربەتاوییانە گەڕێین کە چاومان پڕ دەکەن لە بەفر

باوازبێنین لە چاوەروانی خۆرهەڵاتنی ئەم عاشقەمان / خۆر    لە چاوانمان

ئاوا بوو

بەر لە سەمای باڵندە و گەڵا رەنگ زەردە عەبەسییەکان , خۆمان

لە گەڵ مەرگ راهێنا

ئاوێنەکان بە دڵ پڕ کەسەر و مەراقەوە شکان

ئەوە گوناهی شێواوی کچە ئەسمەرە لێو بە خەمەکانی هاتنمان بوو

ئەوە چ گەمەیەکی خۆ کوشتنە

**با باز بدەین / بە ناو بازنەی ئاگرەکانی ئەم دەریایە**

**ئاگراوییە**

**ئێسقاناوییە**

**خەڵووزاوییانەمان**

**جەرگبڕن ئەو رۆژانەی ,**

**لە نێو قووڵایی چاوەکانتان دەریاچەیەکی هێمن بووم**

**پەنجەکانم , قەڵەمەکەم ... لەوێندەرێ بەجێ هێشت .**

**چیتر گریان دادمان نادات / ئەوە چ مەسافەیەکە نێوانمان..؟!**

**با سیحراویتر بڕوانین / مەچەك لە درەختە عاتیفەییەکانی**

**خەونەکانمان بەربدەین**

**ببین بە قامکە کریستاڵییەکانی شەو**

**با بۆ رۆشنایی ژوورە تاریکە داخراوەکان**

**ببین بە کلپەترین هەناسە .**

**من بە سەوزایی فیردۆسگەکانی عەشقدا هەڵدەڵێم**

**کە فێرە فڕینی پەپوولەییان کردم**

**من کڕنۆش بۆ درەخت و رووبار دەبەم/ کە فێریان کردم لە**

**بەر باران رابکشێم**

**ئێوەش / هەموو دەمەو ئێواران و هەموو درەنگە شەوانێك**

**لە پێدەشتی بیرکردنەوەکانمدا**

**چراخانێکن / لە مانگ بە تریفەتر و**

**لە با بەلەنجە ترن**

**دێمەوە نەبادا رۆژێك دابێت**

**جەستە یاقووتییە درەختییەکەم بکەنە دیاری بۆ بەسەرهاتە**

**ئەفسانەییەکانی ناو کتێبان**

**دێمەوە بە درەنگ وەختەوەش بێت**

**بە مەمکە پر لە موعجیزەکانی خۆتان ئاشناتان کردم**

**من هەر لە ئەزەلەوە /**

**بە برینەکانی خۆم شەوە رابردووە هێمنە زریانەییەکانی خۆم**

**سوور کردووە**

**ئێوەش / پەنجەرەیەکن لە بزە گەرمەکانی خۆرەتاو و**

**خۆتان لە قەد و باڵای تەمەنم ئاڵاندووە و**

**پەرستگایەکن لە**

**ئەڤین ...!**

**تشرینی یەکەمی 1999**

# سؤراخ

له ترۆپكيترين هەرەتی جوانيم

گەمە بیٚ ئاگاييەكانم بە گۆبەندیان بردم

له شەويٚكی شەپۆلاوی و

له رۆژيٚكی پڕ له رازو

له ئيٚوارەيەكی ئارامی و

له بەيانيەكی باراناوی ....

تريفەی مانگەشەوی عومرم بە وەسيەت چوو

خەونەكانم بە رەشەبا و پەنجەكانم بە بەفر سپارد ... !

گۆرانييەكانم بە بەلەمەكانی دەريای خەياڵ و

تابلۆی يادگارييەكانيشم بە پەنجەرە كراوەكانی" با"

**شەرابە ئەفیونیەکانی خۆکوشتن لێرەیە یان لەوێندەرێ..؟**

**ئێستا لە هەناسەی غوربەتیترین و سەرخۆشیترین ساتە سەرمەستەکانم**

**لەژێر چەترە راموسانیەکان ئەشکێکی گەرم دەنۆشم ئەشکێکی تەڕ**

**تەڕتر لە زەردەخەنەی کەڤاڵێکی خەنەیی**

**بێ‌نازن / کەژاوەی وەرزە هەڵماوییە ئاتەشییە دۆزەخییەکان**

**وەرزە / ئەرخەوانییەکان , تارایەکان , زێڕینییەکان ,بڕونزیەکان**

**گریانی هونەرمەندێکی عاشق و کچۆڵەیەکی ڤینۆسی و تابلۆیەکی سریالی و**

**هەرزەکارێکی سەرخۆش ,**

**چ ئایندەیەکی ئاویی لێ دەردەچێ ... ؟!**

**ئەم ئایندە پەروانە ئاوێنەییانە /**

**خۆرەتاوی خەوناویترین خەونە خۆش خۆشەکانمانن .**

**ئێمە بە گۆرانییە خۆرەتاوییە ئاوێنەییەکانمان و**

**بە ئایندە رووبارییە روون روونە رازەییەکانمانەوە ماوین**

**پایزە**

**دڵ پڕ لە رازترو**

**شەفەقاویترو**

**ئەڤیناویترین لە خەزان .**

**پایزە پایز ...**

**ئەم وەرزە کۆرپەی رەنگە جوانەکانی عەشق رادەژەنێ**

**رەنگەکان گەمە لەگەڵ رازەکانمان دەکەن**

**ئایندەی خۆمان لە نێو مەمکۆڵەی رەنگەکان بە جێهێشت**

**پەراگەندەبوون و فەنابوون لێرەوە دەست پێ دەکەن**

**رەنگە پەنجەرە داخراوەکانی ئومێدمان تا ئەبەد نەکرێنەوە**

**رەنگە چوارشێوەی تاریکی جەستەمان ,**

**دەریا نوستووەکانی زەمەن بە خەبەر بهێنێ**

**دەروازەی موحیبەت لێرەیە یان لەوێندەرێ ... ؟**

**شەوانان چاو دامەخەن**

**ئەستێرەترین یادگارییەکانتان مەنێژن ,**

**زیندەگیتان پیرمەکەن بە شەو**

**فانۆسە کزەکانی ماڵەکانمان مەکوژێننەوە**

**با هەر گۆرانیمان بۆ بڵێن‌دەترسم**

**چیتر کۆترەکان**

**لەبەر دەرگای ژوورەکانمان**

**لە پێش پەنجەرە و**

**لەنێو باخچەی ماڵەکانمان , سەما نەکەن ... !**

**شەوانان چاو لێك مەنێن**

**له پشت دەرگا داخراوەکان زیندەگی هەیە**

**فانۆسە کزەکان مەکوژێننەوە**

**لەودیو تاریکی ماڵەکانمان عەشق هەیە**

**درەختە پایزیەکان مەسووتێنن**

**لەبن گەلاْ هەڵوەریوەکان شکۆفەی رۆشنایی هەیە .**

**بوخچەی باگڕاوندی بیْ گوناهیتان بکەنەوە و**

**له ژێر کاژی  ساکاریتان**

**فریشتەترین پەپوولە مومارەسە لەگەلْ خۆرەتاوی شەودا دەکات**

**ئەم دەریاچەیە بەرەو کوێمان دەبات ... ؟!**

**دەتوورِهەڵدەن ئەو کاتژمێرانەی لاوکە خورافییەکانتان فێردەکەن**

**دەبا دەرگای دەربەندەکان بکەینەوە**

**وەرزەکانمان بە فرمێسکە شەپۆلاوییەکان ئاو بدەین و قژە خاوەکانیان**

**له ئێسکی نەورەسە شکۆفەییەکان بئاڵێنین**

**خەونەکانمان ئارامییە لە ناخی گیا**

**پێکەنینەکانمان عەشقێکە لە خەیاڵی ماسی**

**گریانەکانمان سەمفۆنیایەکە لە جەستەی سروشت**

**دە ئەم شەقامە بریندارە خەوتووانە بە خەبەر مەهێنن**

منيش ليَرةوة ئيَوارة سووورباوةكانم بة هةلَمى سةر طةلاَ
سثيَدةبيةكان دةلاويَنمةوة .

**دەمێکە چرایەك لە نێو لەپی دەستەکانم دەسووتێ**

**تا رۆشنایی شەوەکانتان جوانتر بم ناسێتەوە**

**دەمێکە شووشەیەك شەرابم هەڵگرتووە**

**دەمەوێ لەگەڵ ئەو پاساریانە بیخۆمەوە**

**کە لە ناو چاوەکانیان لەوحەی سۆراخی ئێوە دێتە بەردیدەم**

**لە کاتی مەست بوونیشمان بچینەوە نێو ئامێزی دوێنێمان و**

**لەوێندەرێ زیندەگی هەیە ...!**

**چ وەرزێکی تەمەنمانە ...؟**

**ئەم دەریاچەیەش بەرەو کوێمان دەبات ...؟**

**درەنگە درەنگ لە دەرگای کام پەرژین**

**بچینە ناو ئەو باخچەیەی کە لەوێندەرێ**

**بەهار نەسیمێکی هێمنە**

**کام دەرگا , کام رەشەبا ...؟**

**رۆژژمێری تەمەنمان بە گیا دەنەخشێنێ**

**پایزە پایز / من وەرزەکان و دەریاکان و**

**ئایندەی خۆم بە عەشق ڕەنگ دەکەم بە عەشق**

**ئایاری** 2000

## سەحەر و دوای نیوەڕۆیەکی کەنار دەریا

**شەپۆلەکانی دەریا وا خەریکە پیر دەبن هێندەی**

**بە نێو کۆلانە داخراوەکان و**

**شەقامە تاریکەکانی نێو بازنەکانی خۆرەتاو بسووڕێنەوە**

**فرمێسکی دار سنۆبەرە لماوییەکانیش**

**بەڕووی تابلۆی وەرزە پایزیەکانی یادەکانمانەوە دەبینرێ**

**ئێمە تێکەڵاوبوونێکین**

**لە ڕووناکی و لە درەخت و لە عەشق و ئاگر و سەوزایی**

**ئێمە سەحەرێکین**

**لە مردن و لە خۆرەتاو و لە گەردەلوول و تریفە**

**سەفەرە دوای نیوەڕۆییەکانی کەنار دەریا**

**هەموو داستانەکانی خەیاڵ و بیرکردنەوە  ڕۆمانسییەکانمی گۆڕی**

**یەکەم جارم بوو لە دنیای عەبەسییەتی خەمەکانم دابڕێم و**

**بچمە نێو جێ ژوانەکانی مەملەکەتی ئاو**

**گەمە لە گەڵ ئەستێرە و باڵندە و ماسی و گوڵاڵە ئاوییەکاندا بکەم و**

**گوێ لە گۆرانییەکانیان رابگرم .**

**ئەوە چ لەنجەیەکی تاووسییە/ ئەم مەعبەدی خۆر ئاوابوون و گەزەنگییە؟**

**لێرە برژانگەکان مەست مەستن .**

**بە دەوری چاوە پڕ شادمانییە خەواڵووە خومارییەکان دەبریسکێنەوە**

**لێرە پەپوولە زەردەخەناوییە سێکساوییەکان ,**

**مەست مەستن , مەست مەست .**

**لە گەڵ نەسیمە ئاڵەکانی دوای پایزە رووتەڵەکان دەشنێنەوە**

**مورید و کاهینە سەماکەرە ڤینۆسییەکانیش**

**مەست مەستن , مەست مەست .**

**بە رووناکی دوای شەوە یەڵداییەکان دەگەشێنەوە**

**لە گەڵ یاقووتیترین و زێباترین حەرفەکانی**

**نێوکتێبە پیرۆزەکان**

**سەما دەکەن و دەڵێن :**

ئێمە هەناسەکانی باران و لە دایك بوونە حەقیقیەکانین

سەمفۆنیای نرکە و ناڵە بێداریە لاوژەییەکانی ئومێدە گەورەکانیشم

خۆیان لە باڵا شووشەییەکەی شەپۆلەکان ئالاندووە و

شەوانان دڵۆپ دڵۆپ ئاونگی شەهوەت بە سەر درەختەکانی رۆحمدا دەکەن

.... ئەی دەریا

ئەمە چ مەعبەدێکی هێمنە ؟

ئەم نەشئەی نێو کۆماری مەمکۆڵە ئەفسانەییەکانی موحیببەت

ئەمە چ تۆفانی توانەوە و چ مەحشەری رەشبەڵەکە

لە نێو فیردۆسگەکانی مانگ و لە نێو دەنکە زەیتوونییەکانی نێو کاتژمێرە کەنارییەکان

ئەی بریسکەدارترین ئیستاتیکای زیندەگی

چارۆگە مانگژمێرییە وجوودییەکانی عومرم پڕاو پڕە ,

لە شەوە تاریکەکان و

رۆژە تاریکەکان و

سەدە تاریکەکان و وەرزە تاریکەکان .

چ ملوانکەیەك لە ئاتەشی رەنگەکان و

چ سوورەتێك لە حەرفە

**مەست مەستەکانی ژیلەمۆ نەسیم ئامێزەکانم / لە گەردن دەکەی ..؟**

**ئەی دەریا / کەژاوە ئاوییەکانی رەهێڵە و با**

**لە دایك بوونە خومارییەکانی سەحەرن سەحەر**

**رووناهیتر لێمان دەڕوانن**

**ئاونگیتر زاکیرەمان دەخوێننەوە**

**لەم نێرگزستانی عەشق و لەم شەپۆڵستانی مەمك و**

**لەم سەحەرستانە زیندەگییە /**

**با پەمەییتر ئایندەمان مەست مەست بکەین**

**مەستتر / لە خەوتنی رەنگەکان و مەمکۆڵەکانی دەریا**

**مەستتر / لە زەماوەندی شەپۆلەکان و لە مومارەسەی کۆترەکان**

**مەستتر لە سەمفۆنیای / درەختەکان و باڵندەکان و بەردەکان**

**مەستتر لە پێکەنینی / مرۆڤەکان و گەڵاکان و چەترەکان**

**لە قژە خاوە بەفرینییەکەی دەریا و لە پەرچەمە شین شینەکانی هەور و**

**لە لێوە هیلالییە غرووبییەکەی ماچیش نەرم نۆڵتر .**

**کەشتییە ئەزەلییەکانی مێژووم خۆڵەمێشیترە**

**لە منارە و لە گومبەزی شەوگارستانە سەرابییەکان**

**لەم بخووریترین چرکە نازی مەعبەد / ئەی دەریا**

**بە کام سێلاوی سەحەر و بە کام شەرابە شەنگەبییەکانی رۆح**

**شەوەکانم دەڕازێنییەوە**

**بە کام دڵۆپە فرمێسکاوییە غوربەتییەکانی شیعر**

**پەرچەمی ڕۆژە هەنارییەکانم دەشەکێنییەوە**

**تاکو منیش لەم تەنهاییە سەهۆڵاوییەم**

**لە ئامێزی بریندارترین خەون و گیانبازیترین خەیاڵە ڕەیحانییەکانم و**

**بە ڕازاوەترین ڕازی عەشقە ئەبەدییەکانیشم**

**خۆم مەست مەست بکەم مەست مەست.**

**ئینجا /**

**پەنجەرەیەکیش بدۆزمەوە دوور لێی بڕوانم دوور دوور دوور.!**

**کەنەدا / تشرینی یەکەمی 2000**

## ئایەتێك لە گەڵا چاوڕەشەکانی منداڵیم

## بۆ دایكم

لەنێو برینی پەنجەكانم

هەیكەلێك لە پەراسووەكانی تەمەنە ونبووەكانم راكشاوە

من و گەلاَیەكی چاوڕەش و

شكۆفەترین وەرزە شەوگارییەكانم

لەناو هەگبە چارۆگییەكەی رۆحی دایكمەوە خەوتووین

تەمەنێك لە باوەشی بەرائەتی –با– و

ئایەتێك لە خەمو خەونە ئاوییەكانی منداڵیم

سەرتاپای عومرە بەهارییەكانمی

بە جوانی مۆم و بە ناسكی پەپوولە و بە فرمێسكی گوڵ ئاشناكرد

فۆنەتیكێك لە گەمەكانی باران و نیگارێك لە خوناوی سەر قەلۆغانە

دڕكاوییەكان

تەنافێك لە پەلكەزێڕینە و پیانۆیەك لە بیركردنەوە سەوزە پایزییەكانی پێم

بەخشی

ئەوە منم/ لەنێو برینی پەنجەکانم

شەقامە شەختەییەکانی سەر گۆمە وەستاوەکانی دوێنێم دێتەوە یاد

کە نەمتوانی پیاسەیەکی منداڵانەیان بەسەردا بکەم و

چیرۆکێك لە نهێنی نامۆبوونی گەمە بازنەییەکانمی تیا بنووسمەوە

پەنجە سڕبووەکانی قاچەکانیشم بەنیگایەکی ئەسمەریانەوە

لە پۆتینەکانی ئەستێران و

لە بووکەشووشە بریسکەییەکانی خۆرەتاویان دەڕوانی

حەزدەکەم بگەڕێمەوە نێو منداڵدانی دایکم/ لەوێندەرێ

بە سەمفۆنیای میهری دەریا و بە لاوکەکانی پاکیزەیی بەفر

سەفەرێك بۆ باخچەکانی نێو فیردۆسگەکانی عەشق بکەم

ئەم وەرزانە شەپۆلێکن لە رۆژە مەستەکانی نەوایە گەرم گەرمەکانی خەیاڵ

کە ئایندە بە نەسیم و رۆحیش بە عاتیفە دەلاوێننەوە

ئێمە لە ئینجانە تراویلکەییەکانی سەر مەمکۆڵەی گەڵا دەچین

دارەبازە بۆ شەو دەتاشین سەماش بۆ تریفە سریالییەکانی خەونەکانمان دەکەین

ئێمە لە خۆرئاوابوونە شەرابییەکان و پرچە ئاڵۆزە

تێکئاڵاوەکانی مردن دەچین

کە تەمەنێك لە هەڵمە بە سۆیەکانمان کردە ملوانکەو

**له گەردنی پێدەشتە لیتەییەکانی ڕەشکینمان کرد**

**کارێزە لاولاوەییەکانی سەرگۆناشمان**

**بە باخچەو بە حەوشەی ماڵە گاورەکان بەخشی**

**بە شەماڵی کام وەرز یادە شمشاڵییەکانتان بۆ بنێرمەوە**

**کە سکێجی شەوە زریکەییەکانی کەنار گۆڕستانەکانم ڕەسم دەکەن؟**

**لە ژوورێکی شێداری نێو تەقویمە تاریکەکان**

**کاتێك/ کە رووتبوونەوەی گوڵەگەنمو خەوتنی مانگم لە باوەشی هەور بینی**

**لەو رۆژەوە/ ئەستێرەکانی عاتیفەم چاویان رژاو**

**لێکدانەوە (فرۆیدییەکان)م وەك بوورکانێك لەنێو دەماری بیرکردنەوەکانم**

**سەریان هەڵدا .**

**ئەمشەو دەبمەوە چڵە نێرگزێك**

**لەنێو هەناسە و**

**لەنێو جەستە و**

**لەنێو برینە تاڤگەییەکانی دڵی دایکمەوە چاو هەڵدێنم**

**گوێ لە حیکایەتی-دەنکە هەنار- رادەگرم**

**شل شل لەنێو چاوەکانیدا بۆ خۆم رەشماڵێك هەڵدەدەم**

**لەگەڵ باڵندە دەنووك ئاڵەکانیش**

**سەمایەك لە سەدەفی نازو عیشوە گەرمە یاقووتییەکانی ئەوین**

**بۆ غوربەتخانەی شەوە شیعراوییەکانم دەهێنمەوە**

**ئێستا لە هەورە عەبەسییەکانی نێو حەزە رۆژهەڵاتییەکانی**

**گەورە کچێك دەچم**

**کە بە دەوری بورجە سپییەکانی بەخت مامە سوڕەیی دەکەم و**

**لە ئەڤیناویترین نەرمە بارانی سبەینێشم دەڕوانم.**

**ئەی تەمەن:**

**بەهار تاراییێکی سپی بوو بەسەر لوتکەی زەمەنە رۆیشتووەکان**

**دە کاتژمێری وەرزەکانم رابگرەو کەڤاڵێك**

**لە قوڵینگە بەنەفسەجییەکانی خۆرەتاوم بۆ رەسم بکە**

**ئەی تەمەن:**

**دە لە نێو برینی پەنجەکانمەوە**

**پەنجەرەی چێشتەنگاوی ئەو بەیانییەم بۆ بکەرەوە**

**کە پۆلی باڵندە باڵڕەنگینەکانم /**

**لەسەر شۆستە پیفۆکییەکان بەدیار درەختە چاو رەشەکانەوە**

**ئاخی گۆرانییە چرکە ساردەکانی تەمەنیان/ دەخواردەوە**

**منداڵێکی چەتوونیش**

خۆی بەدار تەلی نیگا ماندووەکان دەئالآندو
بە شیلەی سروودە گەرمەکانی نێو کتێبە رەنگ زەردەکان
کۆلارەی منداڵی خۆی دروست دەکرد.
زانە سك پڕەکانی ئەو سەردەمانو
خەمە سیبریا گوناهەکانی نێو ژوورە بێ رۆشناییەکەم
نەرمە "با" ئەڤیناوییە پرشنگاوییەکانن
بە گۆنای شەقامە سوورەکانی مێژوومەوە دیارن

هێور هێور/
یادەکانو ناونیشانم لەنێو رووبارە ماندووەکانی شیعر دەنووسمەوە
هێور هێور/
برینە گەرمەکانی دڵی دایکم
بە کێڵگەی نێو شەوە خامۆشە غەریبەکانی نێو چاوەکانم دەگێڕن
منیش لە مەودوا حیکایەتەکانم بە بوخچەی ئەم برینانەم دەپێچمەوە
تا رووبارو گوڵو ماچی گەڕانەوەم
بە ئایندەو شیعرو خەون نامۆ نەبن
تا چرایە گەشەکانی نێو ئەستێرەی ژیانەوەم
بە نێو کۆڵانە تاریکەکانی ئەڤینیم نەکوژێننەوە

**هێور هێور/ گۆرانی**

**بۆ من و دایکم و عەشق و گەڵایە چاو رەشەکانم/ بڵێنەوە.**

**شوباتی2001**

# گەلەرییە تاریکەکانی باخچە

_ 1 _

**لە رەونەقی شەوە خامۆشەکانی خەیاڵ**

**ساتێك بۆ سەمای تاووسەکان و**

**بازنەیەك بۆ گەمەکانی ئاو نەماوەتەوە**

**سەمفۆنیایەك بۆ لەرینەوەی هاوکێشە لاولاوییەکانی**

**رۆژگارە ماندووەکان نابیستریٚ .**

**ئیدی/**

سانا نییە: لە سەینوریترین* بەردبارانەکانی ئەودیو کۆمارەکانی خەون

بڕوانین .

شیلانیترین وەرزەکانی مەرگیش بمانلاوێنێتەوە .

دەکرا ئەم باریکە رێیە نەمانباتەوە نێو قووڵاییەکانی دەریا

دەبووایە بەر لە لێکترازانی ماسوولکەکانی گوڵاڵە بۆنخۆشەکان

پیاسەیەکمان بەنێو جوانییەکانی درەخت بکردایە .

دەبووایە بەر لە بەسەرابیوونی منداڵدانی خۆر

کێڵگە سەوزەکانی پایزمان ئاوڕشێن بکردایە .

ئەم هەموو بەتاڵکردنەوەی ئەم ئەلبوومانەی تەمەن لە پای چی/ ئەی گوڵم..؟

من لەنێو ئەم رۆمانەی زیندەگییەم شکستم خوارد

خەونەکانی خۆم بەپێنووسی تریفە لەنێو لەپی–با– نووسییەوە

من دەمویست/ شەقامەکانو باخچە ترێیەکانی نێو ساتە ئومێدەییەکانی

برووسکە لە گوڵ هەڵکێشم

نییەتم نەبوو سواندەیەك لە بێزارییەکانی شەو بۆ بانێژەی

چاوەکانم دابنێم

دەکرا/ کەڤاڵەکانی ئەم لەدایکبوونەوەم لەپێش دەروازەو

لەنێو ماڵە ئاگرینەکانی بەفرو

ماڵە سوورخنەکانی خۆر هەڵواسرایە .

**دەكرا / هەموو عاشقەكان بەر لە خۆكوشتنيان**

**گەلاَكان بەر لە هەلْوەرينيان**

**بالْندەكانيش بەر لە كۆچكردنيان**

**وەسيتەكان‌و نهێنييەكانی دلْی خۆيان**

**لەسەر سينەو لە نێو مەمكۆلْەكانی من حەشاردايە**

**ئيدی/ ئەم سەرچۆپی رەشبەلْەكی مردنە بە من ناگيرێ...**

**ئەی گولْم..؟!**

**من نەمتوانی بەهاری باخچەكانم پڕكەم لە باران‌و**

**خەرمانی خەوە خۆشەكانيشم پڕكەم لە عەشق**

**دووبارە زناری فريشتەكانی دۆزەخمان لە كەمەری**

**ئەبەدييەتی مێژوو بەستايەوە .**

**حەيف/ شەونخوونی كاروانسەرای عەشقە گەرمەكانم**

**بە وڕێنە شەوانەييەكانی نێو ئامێزی شيعر كۆتايی هات .**

**ئەوە زەنگی شەوبەراتی چ ئايندەيەك بوو... كە وای كرد**

**كەنارييە ئێسك سووكەكانی جنسی ئاگر**

**لە نێو قەفەزەكانی هەور زيندانی بكەين...؟**

**ئێستا من لە بناری وەرزی ئازادبوونی مەمك**

**چاوی سپێدەی خەمەكانم ماچ دەكەم**

دیرۆكە گەرمەكانی دوێنێم

لەگەڵ بەستە سیحراوییەكانی كچە دەریاوانەكانی شەونم

لە ناو كتێبێكدا

پێكەوە دەیاننووسمەوە

وەكو یادداشت لە كتێبخانەی عەشق هەڵیان دەگرم.

ئێستا لە نێوان خوێندنەوەی خۆم‌و ئایندەم

لەنێوان خوێندنەوەی خۆم‌وشیعر

سینگم مەرەزێكی تێنوو تێنووە .

لە لەنجە بە عیشوەییەكانی باران‌و شیعر دەڕوانیٚ

ڕەنگە/ لە نابەڵەدیی هاتنەكی ناوەختەوە بووبێت

بەم كارەساتە جەرگبڕانەی مێژووت سپاردم .

دەپێم بڵیٚ ئەی گوڵم ,

كانییەكان كەی چاو هەڵدێنن و گوڵی مەنفاكان كەی دەپشكوێن...؟

چ وەرزێكی ئەرخەوانییە ئەم مردنەمان

لە نێو خەونە گڕگرتووەكانی نێو نامەكانەوە

شمشێر لە تەونە پەپوولەییەكانی عەشق هەڵدەسووین

نەمانتوانی پەنجەرەی برینەكانمان بكەینەوەو بۆ شنەی "با"

دەستمان بەو تەلیسكۆبە ڕانەگەیەشت

که دڵتەنگیی کێڵگە سەوزەکان و هەناسەکانی مانگمان بۆ بخوێنێتەوە

ئیدی/ لە نێو خوێنی نێو دەماری شەقامە شووشەییەکانی

عومرێکی دووردرێژ

خۆڵەمێشی جۆخینە هەڵبزڕکاوەکانی نێو کتێبی فەیلەسووفەکانم بینی

تازە بڕیار بۆ من چ مانایەك دەبەخشێ... ئەی گوڵم ... !

لەناو ئەم تەلبەندی لەدایکبوونەوەیەی زەمەن .

بە بێدەنگی خۆم/

هێڵە گیاییەکانی شەوگارتان بۆ رەنگ دەکەمو

کەرنەڤاڵێك لە زیکر

بۆ بەعاشقبوونی سروشت دادەبەستم

بە بێدەنگی خۆم/ شەپۆلە لماوییەکانی حەزەکانتان بۆ رەنگ دەکەمو

کەرنەڤاڵێك لە مەشخەڵی ماچ

بۆ بە عاشقبوونی ئایندەتان دادەبەستم

بە بێدەنگی خۆم/

شوعلەی سەفای وەرزەکانی توانەوەتان

بۆ رەنگ دەکەمو کەرنەڤاڵێك لەخەون

بۆ بە عاشقبوونی فیردۆسگەی سێو دادەبەستم.

-2-

**لە ڕەونەقی گەمە مرواریپیەکانی خەیاڵ**

**جۆگەلەیەك بۆ باڵندە ئاوییەکانی زریانو**

**ئێوارەیەك بۆ سێبەری درەختە تەنهاییەکانی ناز نەماوەتەوە**

**کەنار کەنار**

**لێوار لێوار**

**بنار بنار**

**بەرەو تاریکستانی دۆڵە  قووڵ قووڵەکانی ئایندە نادیارەکان**

**شۆڕدەبینەوە**

**دەکرا هەر لە سەرەتای نووسینەوەی ڕۆمانە ڕۆژهەڵاتییەکانی عەشق**

**سەرەتایەکمان بۆ مردنەکانی خۆمان بنووسیایە...!**

**شەڵاڵم کە شەڵاڵ/ لە نێو شەپۆلەکانی ئەو فیردۆسگەیەی ئێستا هەناسەی**

**وەڕسبوونە**

**نوورانییەکانی لێ دەبارێ.**

**سەرخۆشم کە سەرخۆش /**

**لە نێو زیکرە مەعریفییەکەی ئەو پەرستگایەی**

**ئێستا ختووکەی نەمریم پێ دەبەخشێ**

**لەکام لاوە ئاگر لەتارای تەمەن و**

**لە پەڕە ڕەنگینە هەڵوەریوەکانی پەنجەکانم بەردەدەی...؟**

**ئەمە دەورانە دەوران...!**

**ئیدی/ ئەم سەرچۆپیی ڕەشبەڵەکی لە دایکبوونەوەیە بە من ناگیرێ... ئەی گوڵم.!**

**لە کام لاوە دێیتە نێو دەلاقە کریستاڵییەکانی ڕووناهیم...؟**

**بەبلووری ئەفسانە مەزنەکان**

**لاوکی هەڵوەشاندنەوەی کۆشکە گزیرییەکانی وەهمم بۆ لێ بدەی**

**ناولەپی دەستەکانم لەمەودوا بە خوێن سووردەکەی یان بە خەنەی ئاو...؟**

**ئیدی کە جۆلانەیەك بۆ (زەمەنو سروشتو مێژوو) نەدۆزمەوە**

**چ لە ئەبەدییەتی عەوداڵبوونە دەروێشیانەکەی خۆم بکەم...؟**

**گەر ڕەشماڵە ڕەوەندییەکەشم هەر بەسەر پشتی ئەسپی گەردەلوولەوە بێت**

**چ لە بەرائەتی مەلۆتکە سپییەکانی سبەینێم بکەم...؟**

**من دوێنێ مەرگی خۆمم بینی**

**لاشەکەمیان بۆ گۆڕستانەکەی ئەودیو ماڵی دایکم دەبرد**

**لەوحەکانی گەنجێتی تەمەنی خۆمم بینی**

**لە ژێر ڕەهێڵەی باراندا دەگریانو ڕەنگەکانیان نەدەخوێنرایەوە.**

**ئەو پەڕەسێلکانەی پەلکەزێڕینەی خەونەکانی خۆیان**

**بە وشەی نێو سروودەکانم دەنەخشاند**

**لە ڕێوڕەسمی مردنمدا ماڵئاواییان لێ کردم**

**ڕۆیشتن/ ئیتر ناگەڕێنەوە**

**ئێستا من تەنهاترم لە سپێتی بەفرو**

**لە پێکەنینی سنەوبەرو لە لێو بە خەندەیی ئاو**

**بە مەرجانە یادگارییەکانی باوکمدا دێمەوەو**

**کوورەی ئاگردانی شەوەکانم دادەگیرسێنمەوە**

**بۆخۆم دەچمەوە نێو گەلەرییە تاریک تاریکەکانی باخچە**

**بخوورێك لە :**

**جوانییەکانی گیا**

**جوانییەکانی برووسکە**

**جوانییەکانی شیعر هەڵدەکەم...!**

**دەست بە نووسینەوەی نۆڤلێتی –ترێی وەرزەکانی ڕەشەبا–**

**دەکەمەوە**

**لەمەودوا لە نێو بژوێنی سیحراویترین و ئاڵئاڵیترین**

**مێرگە گوڵە گەنمییەکانی/ نێو چاوەکانی خۆرەتاو**

**ڕەشماڵەکانی تەمەنم هەڵدەدەم**

**چرای سەمفۆناییەکی ئارام ئارامیش**

**بۆ هێور بوونەوەی برینی وشەکانم دادەگیرسێنم**

ئیدی/ ئەمە چارەنووسە چارەنووس...!

ئەم سەرچۆپیی رەشبەڵەکی سپێدەیەش بە من ناگیرێ /

ئەی گوڵم...!

حوزەیرانی 2001

*سەینور: ناوی ئافرەتێکە، لە تورکیا دراوسێمان بوو.

## سەدەفە لاهوتیەکانی رۆژهەڵات

سەدەکان بەمردوویی لە دایك بوون , لە نێو کازیوەکانی زەمەن و هەناسە گەرمەکانی سروشت . ژوورێك پڕ لە ڕەنگی جوان و تابلۆیەك پڕ لە ئەندێشە و تاڤگەیەك لە سەمفۆنیای ئەوین بە کاتژمێرەکانی تەمەنمەوە هەڵبواسن . ریشاڵ ریشاڵ برژانگەکانی بێهودەییم لە سەدەفە لاهوتیەکانی ڕۆژهەلات دەربکێشن .

لە نێو چیمەنە فۆبیاییەکانی سپێدە , تەمەنە بازنەییەکانی خۆم بەخشی بە مەعبەدە هێمنەکانی " با"

نم نم پەرتبوونەکانم کۆبکەنەوە و بم بەخشن بە جوانییەکانی شەونم . بم بەخشن بەو ئایندانەی پڕاو پڕن لە ئەزموونەکانی گەلاّ , ئەزموونەکانی بارانە بەهارییەکانی بەرائەت . من زەمەنی دوای هێووربوونەوەی فەلسەفەم , لە نێو دەفتەرەکانی پەلکەزێڕینەدا . نم نم مێژووە بریسکەییەکەی تریفەتان بۆ دەنووسمەوە .مردنی / سێبەری ئێوارە خەمۆکییەکان و کەللەسەری منداڵێکی لە خاچدراو ویۆرترێتی شاعیرێکی ئاوی-تان بۆ رەسم دەکەم . سوپاس / بۆ ئەو فەیلەسوفانەی چرایان بۆ هەڵکردم تاکو تەنهایی خۆم لە نێو تەنهایی مانگدا بدۆزمەوە . .. ! سوپاس / بۆ ئەو ژنانەی فێریان کردم قژە خاوەکەی شیعر دابهێنم و لە نێو ئاوێنە شەختەییەکاندا عاشقۆڵەیەکی ماندوو بم .من لە سەرەتادا فریشتەیەکی

**گیایی بووم. ئێستاکە رووبارێکی ئاگریم رەنگە سبەینێ منداڵێك بم لە بروسکە .**

**ئێستا / سپێدەکانی خەون ...**

**کۆترەکانی مۆسیقا ...**

**شەپۆلە کچێنییەکان ...**

**لە پەپوولە هێمنەکانی نێو شیعرەکانم دەچن**

**ئێستا /**

**پێکەنینە سپییەکانی رووبار**

**هەتاوە تازەهەڵاتووەکانی بەفر**

**بە کۆمەڵ مردنەکانی سێو ...**

**لە کەپرە دار مێوەکانی نێو شیعرەکانم دەچن .**

**زۆر دەورانم بینی / کۆچ و کۆچبار و کۆچڕەو و هەوراز و نشێوو رۆژگارە یەك بە دوای یەکەکان و ساڵەکانی نێو تەمەنم تەواو بوون.**

**وەرزەکان و سەدەکانیشم تەواو کرد .**

**لە نێو دووبارەبوونەوەی مێژوو / پێکەنین و مردن**

**تازەترین هاوکێشەیان فێرکردم سیبریاترین دۆزەخیان پێناساندم**

**خەون/ هەمیشە خەون .. هەمیشە خەون .. هەمیشە خەون**

**ئاگر / هەمیشە ئاگر .. هەمیشە ئاگر .. هەمیشە ئاگر .**

**با / هەمیشە با .. هەمیشە با .. هەمیشە با .**

**خەون و ئاگر و با ....**

**رەنگە ئاڵەکانی غوربەت پێکدەهێنن**

**لە نێو هەمیشە شکستەکاندا گۆرانییە بازنەییەکان دەڵێنەوە**

**چـیا گۆپکەیەکـە لـە خەمــەکانی شمشــاڵ / ئاوێنــەکان روونــاکی جەنگــە گەورەکانن**

**بە میرات بۆمان ماونەتەوە .**

**گەڕان لە نێو شەقامە درەختییەکانی ئارەزوو و ساپساپانێیە بەردەوامەکانی عەشق و بەرخودان / مانەوەیە لە نێو ژوورە پشکۆییەکانی نەمری ...**

**هەمووومان لە نێو خەیاڵە جوانەکانی شیعر**

**لە ژێر رەشماڵە نەسیمییەکانی ئاو راکشاوین .**

**ئەوین و ئەسرین و ئەفرین و ئەژین**

**برینە سێلاوییەکانمان و خەمە خومارییە شەوینیەکانمانن**

**بە قژە خاوەکەی مردن دامانپۆشیون**

**خەوە خوماریەکانمان پڕ لە ترس و گومان بوون .**

گومان/ له مۆرفیمی ئۆپەرێتەکانی منداڵیم و
گومان / له سلاٌواته بەرائەتییەکانی دایکم و
گومان/ له زەردەخەنه خەواڵووەکانی شەبەق .
چــرکەکانی مێــژوو / بــەر لــه هــاتنی ســەدە سەرخۆشــەکان و وەرزە سەفەرییەکان
دار هەناری موحیببەت و مانگەشەوێکی سێکسی بوون.
بەهارێکی خونچەیی و پایزێکی عاشق بوون.
موحیببەت رژایه نێو چاوەکانی خەزان /
خەزانەخەوتووەکانی نێو
سرووده نیشتیمانیەکان و نێو ئولبوومه بیٚ دەنگەکان و نێو گۆشه و شـەقام و
نێو کۆڵانەکان و باخچەکان و
زێرابه تاریك تاریکه لاهووتیەکان.
بیرەوەرییەکان کاتژمێرێکی قورمیش نەکراو بوون ,
مەچکۆیەکی گریاو و شێخەڵلاٌیەکی ونبوو و لەقلەقێکی
بیٚ ماڵ بوون...
له نێو ئێستاتیکای رۆمانەکانی جەنگو کڕنۆش بردنەکانی نێو
پەرستگاکاندا .

**ئەو بت وسەنەم و پەیکەرانەی لە بەردو دارو قوڕ دروست کرابوون**

**کاتێك نوێژە چەمانەوەییەکانمان بۆیان دابەستا.**

**بە قسە هاتن .**

**لە شەوە بەر ئاگردانییەکانی مەرگ /**

**حیکایەتە درێژەکانیان بۆ گێڕاینەوە**

**وێنەکانی فیردەوس و دەسرۆکە دۆزەخییەکانیان پێمان بەخشی**

**دەرگاکانی جامخانەی ئەودیو بازنەی خەونەکانیان بۆمان کردەوە .**

**گەلەرییە وەهمیەکانیان بۆمان نمایش کرد .**

**جەنگ هەمیشە جەنگ / کرنووش هەمیشە کرنووش / فیردەوس هەمیشە فیردەوس.**

**لە نێو ئەو لاوکە زگماکییەدا سەدەفەکانو دەرگاکان و پەنجەرە نەکراوەکانی ئایندەیان بۆمان خستە سەر گازەرەی پشت / پشتی**

**شەپۆلە ماندووەکانی نێو دەریاچەکانی گەردەلوول....!**

**هۆگری و هێمنییە لاهوتیەکان بوونە دەلاقە عەبەسیەکانی نێومالّەکانمان**

**گالتەیان بە مەعریفە عاتیفەییەکانی نێو کتێبە تۆز لەسەر نیشتووەکانمان دەهات.**

**لە پێدەشتەکانی ئەم لاوکە زکماکیەدا**

**رەشەبا هەلّیکرد , بورکانە دێوەزمەییەکان دەربوون .**

**نهێنییه حەشاردراوەکانی نێو زیندانەکان و ئەشکەوتەکان / ئاشکرا بوون**

**فانۆسەکان سروودەکانی خۆیان دەست پێکردەوە .**

**رووبارەکان لە خەوبینین بەردەوام بوونەوە , هەورەکان راچڵەکینەوە و**

**باران**

**نم نم داباریەوە .**

**رووناکییەکان لە خەو هەڵسانەوە / کچۆڵەکانی نێو داستانە قەڵا**

**دمدمیەکانی**

**گوڵە گەنمیش خۆیان رووت کردەوە .**

(( **خۆیان دایە بەر تریفەی مانگ و مانگەکانی تریفە** ...!

**خۆیان دایە بەر خۆرەتاوی سپێدە و سپێدەکانی خۆرەتاو**

**پێکەنین لەگەڵ / رەنگە جوانەکانی بەهار و بەهاری رەنگە جوانەکان** ...!

**سەمایان کرد لە گەڵ / تیشکەکانی فانۆسە گەشەکان و فانۆسە گەشەکانی**

**تیشکەکان** ...! ))

**بە دەنگێکی نەرم وتیان :.**

**ئێمە کۆرسی گۆرانییەکانی دەریا و چەم و کانیەکان بووین .**

**ئێمە بێشکەی گوڵە تازە پشکووتووەکان بووین .**

**ئێمە باخچەیەك بووین پڕ لە سەفا /**

**گوڵەکانی بەر پەنجەرە و بالکۆنەکانی عەشقمان ئاو دەدا**

**بە دەنگێکی  نەرم نەرم وتیان:.**

**لە بیرتان بێت ..**

**لە وەتەی شەقامەکان و گەڕەکەکان و ماڵەکانمان**

**بە رەنگە مردووەکانی نێو سەدەفە لاهوتیەکان هەناسە دەدەن**

**شەوەکان بەسەر پەیژەکان هەردەزەنن و دووبارە دەبنەوە**

**دووبارە دەبنەوە / مەراسیمەکانی ئەنفال و کەرنەڤاڵەکانی کۆڕەو و**

**سەمفۆنیا خەمناکەکانی مردن ...!**

**چ شەوێکی لاهوتی و چ خەوێکی ئەشکەوتی و**

**چ عاشقێکی بیٚ پەروای  ئەی رۆژهەلاٚت...!**

**لاهووت .. لاهووت .. لاهووت .. لاهووت...!**

**لە نێو رەنگە جوانەکانی سروشت لە دایك بووی**

**لە نێو گۆرانییە خۆڵەمێشییەکانی "با"ش**

**ژن و ژانە کەمانجەییەکانت  .**

**بە سوورەتە  مردووەکانی مەملەکەتی ئەفسانە سپارد .**

**ئەفسانەکان بوون بە خەون .**

**خەونەکان خزانە نێو گەرووی رەنگە ئاچووغەکان.**

**لە نێو وەرزە رۆزاییە زارۆکییەکاندا/ سەمفۆنیاکان بەردەوام بوونەوە**

**ژن و ژیان بوون به ئەفسانە .**

**ئەفسانەکان بوون بە خەون . خزانە نێو گەرووی "با "وە**

**فرمێسکەکانی گەڵابوون  بە سروود/ سروودەکان بوون بە ئەفسانە**

**ئەفسانەکان بوون بە خەون و خزانە نێو باوەشی خۆرەتاوەوە**

**لەوکاتەدا / بازنە ئاگرینەکانی دەورەی پێکەنینەکانی بەفر دەکرێنەوە**

**پەرییەکانی ئاو بە لەنجەوە جوانییەکانی خۆیان نمایش دەکەن**

**سەدەفە لاهووتیەکانیش دەبن بە ئەفسانە**

**ئەفسانەکان  دەبن بە هەڵم / هەڵمەکان دەخزێنە نێو بۆشاییەکانی ئاسمانەوە . لەوێندەرێ / لەو زەمەنە زێڕینەدا رۆژهەڵات گزنگ دەدات و دەبێتە میدالیای سەر سینگی خۆرەتاو ...!**

**کەنەدا/ ئاياری 2002**

# خۆڵەمێش و خەونەکانی مێینەی شیعر

**لە مەودوا گەرمتر لە ئاگر و سەوزتر لە باخچە دەڕوانم**

**نەرمتر خۆم دەخزێنمە نێو دەمارەکانی با**

**بخووریتر دەچمە نێو سپێتی هەور ,**

**درەختیتر جوانییەکانی خۆم بە سروشت دەبەخشم**

**ئەشقیاتر دەچمە نێو ئێوارە هێمنەکانی بەهار**

**خۆم و دەسکە گوڵێکی گەش ,**

**ئەو باریکە ڕێیانە بەسەر دەکەمەوە کە بە شنەبایە خۆڵەمێشییەکان**

**هەناسە دەدەن**

**خۆم و سەبەتەیەك پڕ لە خەونی کریستاڵی ,**

**دەبمە میوانی پەلکەزێڕینە**

**لە پەنجەرەی شەوە شەونمییەکانەوە**

**لە کەرنەڤاڵی ئەو بەیانییە دەڕوانم کە بەدیار جەستەیەکی ئاگراوی**

**پەرداخێك لە شەرابە زیباکانیان هەڵدەدەن ...!**

**هەر بەو ڕوانینەوە / دەچمە نێو ...**

**چاوە کەنەفتەکانی شەو**

**چاوە قورمزییەکانی باڵندە**

**چاوە ئاوریشمییەکانی ئاو**

**دەچمە نێو خەڵوەتگە شووشەییەکانی باران .**

**لە نێو مێیینەی شیعر کتێبەکانی بەفر دەخوێنمەوە و**

**خۆم بە جوانییەکانی ئەستێرە دادەپۆشم . لەوێندەرێش**

**دەچمەوە نێو گەمە منداڵییەکانی. رازەکان و کێڵگەکان و رەنگەکان**

**دەبا زەنگوڵ زەنگوڵ ,**

**زەردەخەنەکانمان ئاشنا کەین بە ئایندە زەردەپەڕە زێڕینییەکان**

**با مۆمەکانمان هەڵکەینەوە و**

**سەماکانمان دابەستینەوە ,**

**رێگاکانیش فەرش رێژ کەین,**

**لە پێشوازی ئەو تابلۆیە /**

**مەشخەڵاوییە ئەڤیناوییە ئاتەشاوییەی**

**دەمانگەیەنێتە,**

**نێو هەوارگەی سرووتە سوندسیەکانی سەرفرازی .**

**من داستانێکم لە شەپۆلە بێهودەییەکانی ئاگر .**

**کەڤالێکم لە شەقامە خەوتووەکانی برووسکە .**

دارهەنارێکم لە باخچەی تەنیشتماڵەکانی ئەستێرە .

پەیژەیەکم بۆ گەیشتن بە هێشووە ترێیەکانی ئەڤینی .

دیوانێکم :

پڕ لە زەنگیانە بریسکەییەکانی شیعر .

پڕ لە ساتە سێکساوییە ئەفسووناوییەکانی ماسی .

من گیتارێکم :

لە خەمە زەردەکانی پاییز, لە نێو کاتژمێری گۆرانییەکانی منداڵآن راکشاوم

.

قەسیدەیەکی درێژم :

لە نووسینەوەی گەشتە بەردەوامەکانی خۆرەتاو .

لە کردنەوەی گرێی خەونەکانی رووناکی .

بم خوێننەوە ,

بەر لەوەی بچنە نێو خەیاڵە رۆمانسیەکانتان و

مەمکۆڵەی ئارەزووەکانتان بگوشن ... !

بم خوێننەوە / بە زمانەکانی " سێبەر و ئاگرو ئەوین " .

بم خوێننەوە ,

بە هەناسەکانی شەو , بەلەنجەی پیاسەکانی ئێواران .

**بە کاتژمێرەکانی دەریا, بە خەونە زایەندیەکانی ژنە راهیبەکان**

**من لە نێو دەلاقەی دڵە گەورەکانتانەوە راکشاوم .**

**هەموو شەوێ بێشکەی بەرائەتی ئاو رادەژەنم .**

**بە نەغمەی پەڕەسێلکەکانی عاتیفە تریفەکانی لم دەلاوێنمەوە .**

**بە نێو نیگاکانی وشە خەوتووەکانی سێبەر رەت دەبم .**

**دەبمە دەفتەری یاداشتنامەی گیا .**

**دەبمە پێدەشتی ئەو پرسیارانەی لە دەرەوەی زەمەن دەسووڕێنەوە**

**بازنەیەك لە دەوری خەیاڵەکانی بەفر دەکێشم .**

**سواری پشتی ئەسپە راموسانییەکانی لافاو دەبم .**

**بەرز دەفڕم بەرز بەرز,**

**بۆ ئاسمانە شین شینەکانی باڵندە .**

**بۆ نێو شەوە سوور سوورەکانی هەنار .**

**بۆ ئامێزی وەرزە رەش رەشەکانی ترێ .**

**لە ئەلبوومی تەمەنی کۆرپەلەی مێژوو رادەمێنم .**

**چیرۆکی ساتە بەرایییەکانی هاتنی خۆم دەنووسمەوە .**

**ئەوە منم ...**

**بم خوێننەوە ,**

به زمانەکانی " تاڤگە و تارا سپییەکانی ئایندە " .

به زمانەکانی " گوڵەگەنم و نەسیمە عەبەسیەکانی غوربەت "

لە مەودوا دەبیٚ بە نەرمی بە نێو تخوبەکاندا ریٚ بکەین .

بە بەلەمە ئیرۆسییەکان بپەڕینەوە ,

بۆ ئەوبەر مەملەکەتەکانی بیرکردنەوە , ئەوبەر زەمەنەکانی خەون

ئەوبەر وەرزەکانی مردن ... !

دەبێت ئەو تیشکانە بدۆزینەوە کە ئۆقیانووسەکان لە نێو چاوەکانیان دا

دەبریسکێنەوە ,

شەقامەکان دەدرەوشێنەوە و

مەخلوقاتەکانیش لە چاوەڕوانی دا خۆیان لە تاریکایی ئەشکەوتەکان

لوولدەدەن ... !

من سلاٚو بۆ مەرجانەکانی ئاو دەنێرم

بۆ مروارییە ئاڵەکانیش دەشنێمەوە .

بە دڵنیاییەوە دەڵێم ,

کچێنی تاووس لە شەوە خەواڵووەکانی بەهەشت پێویستی

بە سروودەکانی گوڵەباخ و هاوارەکانی لم و راپەڕینەکانی خۆڵەمێشە ... !

کچێنی مێژوو / لە مانگەشەوی کۆلاٚنەکانی ئاگر دەپاڕێتەوە

پێی دەڵێت .. با بڕۆین بەرەو ئیماراتەکانی خەون

**بۆ نێو جەنگەڵە  سەوزەکانی ژیان , بۆ نێو مەملەکەتە**

**ڤینۆسییەکان ,**

**باڵندەییەکان ,**

**درەختییەکان ,**

**شەپۆلییەکان ,**

**تەلیسمییەکان ,**

**بورکانییەکان ... !**

**موچڕکە فۆبیاییەکانی گەردەلوول رایهەژاندم , بۆ نووسینەوەی**

**شکۆفە بێدارییە ئێستاتییەکانی شەو .**

**بە بەستەڵەك بوونی دەمارە ئەڤینییەکانی پڕشنگ رایهەژاندم**

**بۆ خوێندنەوەی دیوی ناوەوەی زەمەنە شەڕانگێزییەکانی رەشەبا**

**من شنەبایەکی سەرمەدیم**

**بە جوانییەکانی پەروانە درەختەکانی خۆرەتاو موتوربە دەکەم**

**بە مرواریییەکانی تۆفان**

**کۆنسێرتە ئاگراوییەکانی دەریا دەڕازێنمەوە .**

**بە شکستەکانی گەردەلوولیش**

**زنجیرە بازنەییەکانی گەردنی گیا دەتاوێنمەوە ... !**

**بگەڕێنەوە نێو هەوارگە تاراوگەییەکانی وجوود .**

**لە سەر سینگی سێوە لاسوورەکانی  رۆژژمێری بەهەشت بڕوانن**

**مۆمێك لە ئارەزوو ,**

**بیابانێك لە حەشیشە ,**

**کانیەك لە تێنویێتی ,**

**بە تەنافی گوڵەباخە وەهمیەکان و دار لیمۆیەکانی خۆکوشتن .**

**شۆڕبوونەتەوە .**

**من لە کوێستانەوە هاتووم لە دەربەندە تاریکەکانی ئاو**

**لە بیابانەوە هاتووم لە ئەشکەوتە سەرابییەکانی لم .**

**لە ئاسمانەوە هاتووم , لە کۆڵانە ئیسفەنجییەکانی هەور .**

**ئەوەی من لە دەفتەری یادگارییەکانی خۆم نوسیوومەتەوە .**

**بازنەکان / لە یەك ناچن .**

**زەمەنەکان / لە یەك ناچن .**

**مردنەکان / لە یەك ناچن .**

**هەموو بازنەکان و زەمەنەکان و مردنەکان .**

**لە پەنجەرەی یەك قەسیدەوە دێنە نێو وەرزەکانی**

**من و جوانییەکانی مێینەی شیعر .**

**لە تەلیسمی یەك شەوگارەوە , دێنە نێو ,**

**سەحەرەکانی من و ئومێدە تاقانەییەکەی  مێینەی شیعر .**

**من لە نێو چاوەکانی مێینەی شیعر / بە پێنووسی حەسرەتەکانی غوربەت و**

**برینە گەورەکانی عەشق .. پێشنیهادەکانی خۆم دەنووسمەوە**

**مێینەی شیعریش لە ناو چاوەکانی مندا / بە جەمالییەتی کەمانجە و بە**

**پیتە زەیتوونیەکانی توانەوە رابردووی خۆی دەنووسێتەوە**

**ئەوە منم / هەموو شەوێ بە تریفەی  مەمکۆڵەکانی مێژوو**

**وڕێنەکانی غوربەت و سووتانەکانی عەشق دەمنووسێتەوە .**

**منیش لە نێو پەرستگاکانی رووناکی ,**

**سوورەتەکانی غوربەت و خەوننامەکانی عەشق دەنووسمەوە .**

**من بوونەوەرێکی ماندووم .**

**لە خۆرهەڵاتی بارانەوە هاتووم ...**

**توورەگەیەك لە خەیاڵە ئەسمەرییەکانی**

**خۆر ئاوابوونم هێناوە .**

**من گەریدەیەکی ماندووم .**

**لە خۆر ئاوا بوونی شکستەکانەوە هاتووم.**

**سپێدەیەك لە شەبەقە**

**نارنجیەکانی خۆر هەڵاتم هێناوە ...**

**من تەتەرێکی ماندووم .**

**لە ناوچە ئەسکیمۆییەکانی  دۆزەخەوە هاتووم .**

وەرزێك لە زەمەنە سپییەكانی ئایندەم هێناوە .

ئەوەی من بە چاویلكە ئاورینگییە ئاسۆییەكەم خوێندوومەتەوە .

لە دایك بوونەكانی لە یەك ناچن .

بەرسێلەكان لە یەك ناچن .

هەڵوەرینەكان لە یەك ناچن .

هەموو لە دایك بوونەكان و بەرسێلەكان و هەڵوەرینەكان ..

بە دەم سەماوە

دێنە نێو رەشەبای یاخی بوونەكانی من و تەمەنە تەنهاییە زامدارەكانی

مێینەی شیعر.

منیش لە نێو قووڵایی سەهۆڵبەندانی ئەوینیم .

ئاگر لە جەستەی خۆم بەر دەدەم .

ئاگر لە شیعرەكانم , لە منداڵی خۆم بەر دەدەم .

تاكو مەمكۆڵەكانی مێیینەی شیعر جوانتر بدرەوشێتەوە .

تاكو ئەستێرە بێوەژنەكانی شەوە سوورەكان .

سووكتر رازە نەدركاوە سێكساوییە شەپۆلاوییەكانی دڵی خۆیان

بكەنەوە و خونچەی حەزە گەرمەكانی جەستەیان بدەنە بەر

نەرمە تەرزەكانی ئێوارانی بەهار .

من رۆژهەلاتییەکی  کۆچەریم ...

دەمەوێ تەنها بۆ چەند چرکەیەك لە نێو چاوە سەوزەکانی درەخت

خەون بە زەردەخەنەی  گوڵەگەنمی روخسارتانەوە ببینم .

بە سەمای مەرجانە بلێسەییەکانی دەریا .

بە هەڵووژە گەییوەکانی بەهەشت .

بە غەریزە چەپێنراوە سپییەکانی خۆم و

بە ملوانکە ئاوییەکانی مێینەی شیعر  ... !

ئەوە منم / لە دەرگا خوێنینەکەی دڵە گەورەکانتان دەدەم .

دەی دەبا بچینەوە نێو بەیانییە ئاوێنەییەکان و

نیگاکانی مانگەشەو و بارانە هێمنەکانی مێژوو .

دەبا بچینەوە نێو کتێبەکانی ئاگر و پێکەنینەکانی باخچە و

گۆرانییەکانی پەلکەزێرینە .

من لەوێندەرێ لە چاوەڕوانی ئێوەدا ..کولیکە سوورەکان و

نێرگزە زەردەکان و رەیحانە بۆنخۆشەکان دەڕوێنم .

کەنەدا /  ئۆکتۆبەری 2002

# بەشی یەکەم

لە ئێوارەیەکی وەنەوشەیی...

گەردەلوولە خوێناوییەکان، خۆیان خزاندە نێو مێژووی

پەنجەکانم... ئیدی منیش

لەناو حەسرەتبوونی گومان .

بە پێکەنینی هەور فریو ناخۆم/ بمگەڕێننەوە

بۆ سەرەتای بە نەغمەبوونی باران

نم نم/ لە شەپۆڵانم هەڵکێشن

تنۆك تنۆك بمتوێننەوە...! بمگەڕێننەوە...

بۆ سەرەتای لە دایکبوونی سێبەر/

سێبەرە سوور سوورەکانی شەو

لە تارا سپییەکانی درەخت بڕوانن

بەرەو ئەوێندەرم بەرن

کە بە دوای توانەوەی خۆر

لەنێو رەشماڵەکانی ئاو، بەفر جەستەیەکە لە سەمای

گومان/ گومانە زەرد زەردەکانی هەناسە.

لەو ساتە بە تەلیسمانەی حەزە کۆرپەییەکانم دەهەژاند

من بووم/ پێ بەپێ شەهامەتی جوانیم بە ژیان بەخشی

ئیتر نم نم-بزەکانتان بشارنەوە

ماسکەکانتان با خۆیان بدەنە بەر نەسیمی گۆرانییە

ماندووەکانی(با)

پەردەی شانۆکانیش هەڵدەنەوە

## شانۆگەریی یەکەم

لەگەڵ سەمفۆنیای وەرزی توانەوە

((دوو ئەکتەر یەکێکیان لە جنسی خۆر

ئەویتریان لە جنسی گیا...))

لەسەر مەزاری عاشقان.. کەرنەڤاڵی سەما دادەبەستن

دوای مۆم هەڵکردن و چەمانەوە

نم نم بەسەر گڵکۆکاندا دەتوێنەوە...!

لەنێو لاپەڕەی چیرۆکە ئاگراوییەکانی عەشق

وەرزە لاوژەییەکانی ئەوسا گەمە بەڕۆینەکانمان دەکەن

بابگەڕێینەوە، بۆ سەرەتای لە دایکبوونی رۆژگارە نارنجییەکانی توانەوە

سەرەتای لە دایکبوونی گومانو

لە دایکبوونی وەرزەکان/

وەرزە رەشرەشە مۆرباوە سپییەکانی خوێن

بابگەڕێینەوە ، بۆ سەرەتای لە دایکبوونی

رەنگەکان و گەمەکان و ماسکەکان و خەونەکان

با نم نم /

لەگەڵ گەردە خامۆشە نەرمە بێ دەنگەکانی تاریکی سەفەربکەین

با نم نم /

لەگەڵ باران گۆرانی بۆ هەتاو بڵێین

پڕشنگ بدەین لە قژی ئێوارە ئاسۆییەکانی ئومێد

زەمەن لەناو کاتژمێرە خۆڵەمێشییەکان

بە مەلۆتکەیی ماوەتەوە/ لێی گەڕێن با هەناسە بدا

لەناو رامانە گرێشمەییە خەمۆکییەکانیدا

لێی گەڕێن لەناو کۆرسی توانەوە بەخەبەری مەهێنن

**زەمەن ژیلوانی بەژەم ژەمە ژانەکانی عەشق راڤە دەکا**

**زەمەن لەناو بێشکەی ئێوارە سپییەکان**

**بە ناسکی پەپوولەو**

**بەسەوزایی بەهار پێدەکەنێ**

**گومان لە کاتژمێری دەریا دەکا.**

**لە کاتژمێری سەفەرە خۆشەکانی چنارە بە عیشوەکانی رووناکی**

**نازانم وەرزەکان چۆن لە دایکبوون...؟**

**زەمەن تا ئێستە بە گومانە**

**لە توانەوەی باران**

**لە توانەوەی/ بەفرو هەتاوو سپیدە...!**

**دەبگەڕێنەوە**

**بۆ سەرەتای ئەو شەوە سوورانەی**

**کە لەوێندەرێ،**

**لە دەلاقەکانی عەشق،**

**کوراسەی توانەوە مۆرانەی لەسەر نیشتووە**

**ئیدی گومان لە چی دەکەن ... !؟**

**لە سوانگەی درێژبوونەوەی سەدەکان**

پانتایی سەرەتای داستانە ئافاتییەکانم هەڵبژارد
دەمەوێ شەڕ لەگەڵ زەمەنە خۆڵەمێشییەکاندا بکەم
چارەنووسیش دەرگا سەوزەکانی تەمەنم کۆدەکاتەوە
لەکەنار لەنگەرگرتن و هێوربوونەوەی زەردەخەنەکانی مەرگ
با پەنجەرەکان هەر لەسەر پشت بن
بوخچەی عەشقە ئەبەدییەکانیش گریێ مەدەنەوە
گوێ لە سەمفۆنیای شەوەکان رابگرن

## شەوی یەکەم

تێکەڵاوبوونی بزەو فرمێسکە سپییەکانی رۆح
راکشانە لەتەك باڵا ماسییە شووشەییە ئاوییەکانی بەرائەت
ئاشنابوون بە ئیستاتیکا لەزنەتاوییەکەی مەمك
خۆ حەشاردانە لەناو کاژی شەرم و گومان و ترس

*دوو رووبار ئاوێزانی یەکتری بوون هێندە/
ئاوێزان ئاوێزانی یەکتری بوون
تا لە دووری دوورەوە بوون بە یەك...!*

نیگەرانم لە لێکترازانی ئەڵقەی

نێوان ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە

نێوان شەقامەکانی خەیاڵ و

گومانەکانی ئەستێرە

فڕین لەبەر باران/ لە دەرگەدانی مەعبەدەکانی مەرگە

نم نم/

شوێنم کەون وەکو هەتاو

وەکو سەدەفی جوانییە خونچەییەکانی ئارامی

نم نم/

وەکو شەپۆلەکانی عاتیفە

لە نێوان مەمکۆڵەکانتان بە ماچ داپۆشن.

کە دەرگاکانی بیرکردنەوە بەڕووی دەکرێتەوە

شەقامەکان سەرخۆش دەبن و زەمەن دەبێتە پیاڵەیەك شەراب

((ئەتەکۆلاکان)) لەم نێوەدا ڕەش دەبنەوە

زاکیرە مەرگی خۆی رادەگەیەنێت

جوانیی سێو خەریکبوو فێری توانەوەمان بکات

**له كەنار دەریایەكی خەواڵوو،**

**بێهوودەیە فڕینی بەربارانمان**

**مەرگ لە شەوژوانەكانی ئێمەوە فێری ئارامی بوو**

**چ فایدەی هەیە ؟**

**كاتێك خۆر لەبەرباران رادەكشێت و كڕنووش بۆ**

**مەمكە وشكەكانی گیا دەبات .**

**باڵندەكان یاخی بوون   لە وشكبوونی جەستەی گوڵە گەنم**

**كانییەكانی عاتیفەش لەوەرزی جۆزەردان بەقامیشە بەهارییەكان**

**شمشاڵ لێ دەدەن**

**بە گومانم/ لە بەرائەتی ماسی/ لە ئارامیی ئاو**

**لە عاشقبوونی سەوزایی.. .. لەسەرخۆشبوونی شەو..!**

**بە گومانم/ لە توانەوەی خۆم ...لە توانەوەی**

**ئەو ژنانەی مەمكۆڵەكانیان كانییەكە لە عەشق**

**نیگاكانیان پیاسەیەكە لە پیاڵەی مەستبوون**

**باڵایان خەونێكە لە گۆرانی**

**بزەیان دەریایەكە لە لەززەت**

**بە گومانم لە هەناسەكانی توانەوەی دایكم لەپێكەنینی وەرزەكان**

**له ڕێگا ئاوریشمییه زیندەگییەکانی ئەڤین**

**بمنێژن له نێو ئەو شەوە سپییانەی**

**خەونم پێوە دەبینی**

**بمنێژن لەتەك ئەو ژنەی كە فێری کردم**

**سروشت چۆن خۆی دەتوێنێتەوە**

**وتی ئاقڵ بە**

**بزانە چۆن دەتوێیتەوە**

**وتی ئاقڵ بە/ ژنان درەنگ دەتوێنەوە**

**وتی ئاقڵ بە/**

**دەسگیرانەکەت فێری توانەوە بکە/**

**ئەی خوێنەر**

**((بمبەخشە بە گومانم لە توانەوەی تۆش**

**تۆ كە دەمخوێنیتەوە ئاشنا نیت بە تابلۆکانی توانەوە**

**ئاقڵ بە تۆش خۆت فێری توانەوە بکە...))**

**بە ڕووتی بمبینە/**

**وەرە لەنێوچاوەکانم تۆش خۆت ڕووتبکەرەوە**

**چەند غەریبن / ئەو ژنانەی کە تا ئێستا شەرم دەکەن**

خۆیان رووت بکەنەوە

مەمکۆڵەکانیان، قۆرتی سەر سنگیان دەشارنەوە...!

ئەو ژنانە/

بێهوودەیە فڕینی بەربارانیان

چەند گوناهن ئەو کوڕانەی تا ئێستا

ژنان بەڕووتی

خەونەکانی خۆیان بۆ نەگێڕاونەتەوە

یاخود ئەو ژنانەی

تا ئێستا لە کاتی مومارەسەکردن

دەستەکانیان لەبن سەریان دادەنێن...!

بە گومانم/ لەو رووبارانەی ناز بەسەر ماسییەکاندا دەکەن

وام دەزانی

شەپۆلەکانیان هاوارێکە لە شەهوەت

وام دەزانی

ئارامیی ئاو....

نەغمەیەکە لە دوای توانەوەی هەور

وام دەزانی

**شەونمی سەرگەڵاکان / شەهوەتی سپێدە سپییەکانن**

**نم نم /**

**دەڕژێنە نێو ڕۆحی ئەو باڵندانەی**

**بە دزییەوە سەفەر دەکەن و یادگارەکانیان**

**بە ماچ دەنووسنەوە**

**بە گومانم/ لەو دەست و مەچەك بە بازنە عاشقۆڵانەی**

**نوێژ بۆ هاتنی باران دەکەن**

**کاتێك ئێوارە سوور هەڵدەگەڕێ**

**ئەوە توانەوەی خۆر نییە لە نێو نیگاکانی زەمەن**

**ئەمە پێکەنینی شەوە بە نێرەمووکی سپێدە**

**دە دەرگاکان بکەنەوە**

**با پەنجەرەکان هەر لەسەر پشت بن**

**پەردەی شانۆکانیش هەڵدەنەوە.**

## شانۆگەری دووەم

**سەوزایی پارکێکی سەبك و جوان**

**گەمە لەگەڵ ئارامیی ئاودا دەكات**

**دوو باڵندەش/ باڵەكانیان لێك دەخشێنن و گۆرانی دەڵێن**

**هەور ئیرەییان پیٚ دەبات**

**باران دادەكات و باڵندەكانیش،**

**بەدەم نەغمەی خەونەكانیان–دەڕۆنەوە...!**

**وەرن با شۆڕشێك بەرپا بكەین**

**تەنیا یەك سەعات كوڕو كچەكانمان با رەها بن**

**تەنیا یەك سەعات**

**گویٚ لە مۆسیقا بگرین و لە ماڵەكانمان سەما بكەین**

**وەرن با شۆڕشێك بەرپا بكەین**

**ئەو كوڕو كچانەی كە دڵخوازی یەكترین**

**با زەماوەندیان بۆ سازدەین**

**ئەو ژن و مێردانەی كە خۆشەویستی لە ماڵەكانیان نییە**

**با لێك جیا ببنەوە...!**

**وەرزەكان لە سەرەڕۆیی خۆیان**

**لە دەركەوتنی هەر شكۆفەیەك دەترسن.**

**لەبەردەم ئاوێنەکان/ گۆرانی بۆ دوێنێ دەڵێن**

**وەرزەکان لە سەرەڕۆیی خۆیان**

**پاکەتێك لە جگەرەی بۆنداریان بە حەقیقەتە**

**ئاوریشمییەکان بەخشی**

**ئەمە تێشکانی گوناه بوو**

**لەبەردەم بەرائەتی عەشق**

**شۆڕشی جوانی مەمك بوو**

**بەرەو ئەستێرەی توانەوە**

**بمنێژن لەتەك ئەو باخچەیەی/ هەنگوینی مەمکۆڵە**

**ئەگریجاوییەکانم**

**بەدەمدا دەکات . تا شەنگەبیترو ناسکترو تەڕتر ببمەوە...!**

**با خۆمان بە تەڕیی باران بشۆین بە تەڕی مەمکۆڵە نەرم**

**نەرمەکانی**

**دەریا...!**

**بمنێژن/**

**لە نێو هەناسەی غروورببوونی ئەو ژنەی**

**بە ساویلکەیی خۆشی ویستم و چیرۆکەکانی توانەوەی**

**نەخوێندۆتەوە**

**بمنێژن/ لە نێو بیرکردنەوەکانی ئەو گولآنەی کە وادەی**

**هەڵوەرینیان بەسەرچووە**

**سەعاتی من زەمەن ناخوێنێتەوە**

**دیسان سەفەرم لە پێشە**

**چیتر نهێنیی شەوە سوورەکان لە کەشکۆڵی دڵم**

**هەڵناگرم..**

## شەوی دووەم

**گریان بۆ ئارامیترین خەو**

**بەیەك جەستەبوونی زەمین و ئاسمانە**

**ئاوێزان بوون و توانەوە**

**بوونی عەشق و رزگاربوونی دەمارە حەژمەتییەکانە**

شةوى سىَ يةم

**خەوێك لە شەوە سەرمەدییەكانی زستان**

**لەنێو یادگارییە بەفریناوییەكانم/ رۆچووم بەرەو ناخی/**

**خۆشبەختی**

**هەر ئەم شەوە**

**جل‌وبەرگ ناسنامەی سەخافەتی بەبالآدا بڕا.**

**چاوە بەكرۆكەییەكان بەزەقی مانەوە**

**لە كوشندەترین‌و رەهێڵەترین روانیندا**

**شۆڕشێك بۆ بەرگری لە عەشق هەڵگیرسا**

**سەمای ناخ‌و ئاوێتەبوون**

**لە نێو خەونە ئەڤیناوییەكانی سبەی**

**خۆ ئالآندن بوو لە تارایەكی سپی بەر پەنجەرەیەكی گەورە**

**گۆرانییە بەخشندەییەكان/**

**ئارامییان بە جەستەی شار بەخشی بوو**

**لەنێو دیمەنە سیحراوییەكانی بێدەنگی**

**عاشقەكان تا بەیانی نەخەوتن...!**

**سەمام پیّ بكە/**

**من ئەڤیندارێكی رۆژهەلآتیم**

**له ده‌روازه‌كانی به‌هاره‌وه‌ چاوه‌ڕێت بووم**

**تۆ له‌ وه‌رزی خه‌زانه‌وه‌ له‌ ده‌رگای دڵت دام**

**سه‌مام پیٚ بكه‌/**

**با په‌نجه‌كانیشم له‌ نێو داوه‌ ئاوریشمییه‌كانی قژه‌ خاوه‌كه‌ت**

**بخه‌ویٚ**

**ئه‌مجاره‌یان من به‌شنه‌ی یه‌ك دوو حه‌رفی غه‌ریب له‌ دایك بووم**

**بیرمه‌ به‌ چرپه‌وه‌ ئه‌م یه‌ك دوو حه‌رفه‌ت پیٚ وتم**

**من له‌مه‌ودوا به‌ چرپه‌وه‌ ده‌دوێم**

**چونكه‌ حه‌رفه‌ چرپه‌ییه‌كان**

**بوونه‌ته‌ خۆشترین ساته‌كانی ئاوێته‌ بوون‌و**

**ساته‌ سه‌ره‌تاییه‌ ئه‌ڤینداریه‌كانی عه‌شقێكی ئه‌به‌دی**

**سه‌مام پیٚ بكه‌...**

**من په‌یامبه‌ری عه‌شقم**

**ئه‌و ده‌مانه‌ی/ دره‌خت كڕنووش بۆ هه‌تاو ده‌بات من گه‌وره‌تر ده‌بم**

**ئه‌و ده‌مانه‌ی/ ته‌رزه‌كانی مه‌رگ ده‌چه‌مێنه‌وه‌ بۆ مرواری‌و**

**سه‌ده‌فه‌ شكۆفه‌ییه‌كانی ژیان... من زیاتر گه‌وره‌ ده‌بم...!**

**عه‌شقی من**

**کێڵگەیەکە لە هەتاو لەناو گوڵاڵە بریندارەکانی بێدەنگی**

**عەشقی من/ شووشەیەکی پڕ لە گوڵاوە دەڕژێمە نێو ناخی**

**ئەستێرە بەهارییەکان**

**من لەنێو نیگای ئەو کۆترانەوە هاتووم**

**کە شکۆمەندیی فڕینیان پێ بەخشیم**

**دەتۆش بفڕە بۆ لام/ بابچینەوە بۆ ئەو شارەی.. لەوێندەریٚ**

**شەپۆلەکان گێژەلووکەیەکی خۆڵەمێشین و**

**زەمەنیش باڵندەیەکی سەربڕاوە**

**وەرە لەنێو گەردەلوولیترین ساتەکانی بێ ئۆقرەییم**

**لەنێو دڵت بمخەوێنەو بچینەوە بۆ ئەو شارەی**

**لەوێندەریٚ...**

**ئاشنا بووم/ بە شەقامە ماندووەکانی نێو لاپەڕە لاولاوەییەکانی**

**ئەڤین**

**ئاشنابووم/ بە هەناسە بەخشندەییەکانی نێو خوێندنەوەی**

**کاتژمێرە ئارامییەکانی ئایندە**

**وەرە بمبەرەوە بۆ ئەو شارەی... لەوێندەریٚ/**

**جەلادەکان دڵیان سەدەفێك بوو لە بخوورە**

**زەمهەرییەکان**

**بۆ ئەو شارەی**

**شیرازەی باخچەکان بە سەرخۆشبوونی من تێك دەچوو**

**کاتژمێری عومرم رابگرن**

**ئایندەم دۆزەخێکە لە چاوەڕوانی**

**چی دەبێت من ئاوێنەی دڵی ئەستێرەکانم شکاندو**

**تۆش باخێك لە لیمۆ لە نێو مەزاری لەپی دەستەکانم بڕوێنە**

**چی دەبێت من وەرزی ئارەزووەکانی خۆم بە تۆ سپاردو**

**تۆش تریفەی مانگی دڵی کوکوختییەکان بەهاواری پەلکەزێڕینەی**

**عەشق بنەخشێنە...دەبفڕە دەی ی ی ی ی ی ی ی...!**

**بفڕە بۆ لام ئەی ئەو کەسەی بە مەمکۆڵە سەدەفییەکانی ماسك**

**پیربوونی پەپوولەکانت بە بەهار ئاشنا کردو چۆڵەوانییەکانی**

**دڵی زستانیشت کردە دۆزەخی چەمانەوەی وەرزەکان...**

**پەنجەکانی خۆت داخ بکە/ بمگەڕێنەوە بۆ ئەو رۆژە**

**ئاڵتووناوییەی**

**هەورەتریشقە دارستانەکانی دڵیان سووتاندم**

**هەر ئەو رۆژە بە جەرگ و دڵی خەڵووزیمەوە ووتم /**

**گەر عەشق نەبێت ژیان نییە**

گەر عەشق نەبێت ئایندە نییە

گەر عەشق نەبێت

توانەوەو

پێکەنین و گۆرانی و شیعر هەر نییە...!

هەر ئەو رۆژە بە جەرگ و دڵی شکۆفەییمەوە ووتم/

گەر شیعرو گۆرانی و پێکەنین و توانەوە نەبێت

ژیان و عەشق هەر نییە نا...!

بمگەڕێنەوە بۆ ئەو رۆژەی/ لە نێو وەرزەکانی گومان

ساتە مەرگاوییەکانی دۆزەخی سەفەرتهێنایە نێوساباتی رۆحم

ئیدی بووم بەعاشقترین ئەشقیا و بە گەڕیدەترین موسافیری عەشق

سەفەری من/ توانەوەی مۆمە چراخانییەکانی گوناه بوو لە نێو

خەونە کریستاڵییەکانی ئاو.

سەفەری من/ درێژبوونەوەی وەرزەکانی گومان بوو لە نێو بزەو پێکەنینە

رووکەشەکانی دڵی باران

سەفەری من/ پاکبوونەوەی باڵندە تریفەییەکانی عەشق بوو

لە نێو رازە بەهارییەکانی رۆحی بەفر

بمبەرەوە بۆ ئەو شارەی/ نامەکانی عەشق لە خاچ دەدرێن و

مەسیحەکان لە چاوەڕوانی گۆدۆدا

**له پێش مزگەوتەکانی دەرۆزە دەکەن**

**بە گومانم لە دوێنێی خۆمو لە ئایندەی بەهار**

**لە نێو وەرزەکانی سەفەری گومان/ خۆم بە باخچە**

**سەرابییەکانی توانەوە سپاردووە.**

**خۆم دەخیلی ئایندەیەك کردووە کە تریفە هەنارییەکان**

**گۆرانی بۆ بەرائەتی عەشق دەڵێن**

**سەمام پێ بکە/ من کوڕە ئەشقیایەکی رۆژهەڵاتیم**

**لە نێو رۆژگارە سەدەفییەکان، خۆم بە ئاژاوەی نێو**

**جەنگەڵستانەکانی**

**عەشق سپاردووە.**

**سەمام پێ بکە/ چرکە خۆشە مەستانەییەکانت بەبزەی**

**وێنەکەمەوە**

**دیارە کە لەنێو مەمکۆڵەکانت خەوتووە**

**رۆژەکان رەت دەبن/ رۆحە دوورەکان دەبنە سەما غوربەتییەکانی**

**خوناوە سپییەکان، بەناو رۆحی گەڵاکان دەچنە خوارەوە**

**رۆژەکان رەت دەبن/ رۆحە دوورەکان عاشقتر دەبنو دەبنە**

**نەسیمی ئێوارە نارنجییەکانی دڵفرازی**

**رۆژەکان رەت دەبن ئەی رۆحە دوورەکانم/ بابگەڕێینەوە**

**بۆ سەرەتای ئەو رۆژگارانەی هێشتا شەوە سوورەکان لە دایك**

**نەببوون...!**

**ئێستەش خۆزگە بەو رۆژگارانەی دوێنیٚ دەخوازم**

**لەوێندەریٚ/ ئایندە هەبوو، عەشق هەبوو، پێکەنین هەبوو**

**لەوێندەریٚ/ سەما هەبوو، ترس هەبوو، مەرگ هەبوو**

**لەوێندەریٚ/ بەرائەت هەبوو، فڕین هەبوو، شیعر هەبوو**

**دەزانم شەوە سوورەکان نم نم، نم نم، نم نم**

**نم نم رووبار ژێر دەکەنەوە لەناو بێشکەی ئارامیدا**

**ئارام ئارام لەناو نم نمەی بارانە بیٚ خەوشەکاندا**

**سەمای باڵندەکانیش بە ماچ دەنووسێتەوە**

**دەزانم شەوە سوورەکان نم نم**

**دەرگاکانی گومان دەکەنەوەو پەنجەرەکانی عەشقیش**

**بەرووی ئایندە داناخەن**

**پەردەی  شانۆکانیش لەسەر برینەکانی هەڵدەدەنەوە...**

## شانۆگەری سێیەم

### -پەردەی یەکەم-

((.. کچێك بەدەم چاوەڕوانییەوە لە بەر باران هاتوچۆ دەکا...))

-ثةردةى دووةم-

((.. لەرێگای نێوان دوو شار: کوڕێك لەنێو پاسێکدا

بەشپرزەییەوە نامەیەك دەنووسێت..))

گوڵە گیان..

ئەوا هاتم خۆمو کۆڵێك عەشق و کۆڵێك سووتانی پڕ تاسەوهیوا

بەنابەڵەدییەوە رێ دەکەم... گەر نەشت دۆزمەوە

خۆ چ نەبێت دێمو سلاّوێك لە شارەکەت دەکەمو

دەگەڕێمەوە...

خۆشەویستت / ئومێد

ئیدی ئەو نامەیە بوو بە سوورەتێکی پیرۆز

رۆژێ سێ جاران نوێژە عەشقی پێ دەکرا..

ئیدی ئەو نامەیە لە مەودوا هەناسەی شەوە سوورەکانە

لە تاریکی رزگارمان دەکات/ پاکمان دەکاتەوە لە گوناهەکان

**فێرمان دەکات لە سەرەمەرگی باخچەکان سەیری سەوزایی**

**بکەین**

**رۆشنایی ئەو نامەیە لەنێو دڵمان شکۆفەی کردووە.**

**وەکو چراخانی شەوە سوورەکان دەبریسکێتەوە...**

## شەوی چوارەم

**لاوکی گریانو بۆنی گۆشتی سووتاو.. شاریان بەخەبەر دەهێنا**

**مرۆڤە بەریئەکان وەکو زەڕنەقوتەی بەر سەرما دەلەرزینو**

**لە ئایندەی خۆیان دەترسان**

**خوێندنەوەی قەسیدەی (دەروازەکانی خۆرەتاو)**

**ئاشکراکردنی خۆزگە بەنەفسەجییەکانی نێو شەوە سوورەکان**

**مەشهەدێکی پڕتاون**

**خۆشۆردن بەبارانی تریفەی مانگ**

**ئەی پاکیزە...**

**کە وەرزە پەپوولەییەکان بەسزای مەرگ دەگەن، دیارە تۆ لە**

**جنسی باڵندە نیت**

**خۆت بتەکێنە با تەونە جاڵجاڵۆکەییەکان لە باڵات ببنەوە**

**خۆت دەرباز بکە لە شوورە خوێناوییەکانی رەشەبا/ چیتر ئەو**

**نەسیمەی لەنێو بەهاری رۆحتایە... بەخەرەندە**

**گۆڕستانییەکانی مەسپێرە**

**ئایندە/ ئێوارەیەکە لە وەنەوشە...سێوێکە لە وەرزە**

**بێدەنگییەکانی پێکەنین**

**پێ لە مێروولە ئارامییەکانی سبەینێ مەنێ. ئۆقیانووسەکانی**

**عەشق دەگرییێن**

**لە قەراخ رووبارە خەمۆکییە تەژی لە سۆلاڤییەکانت**

**تاراسپییە شەوە شەرابیە بەنەغمەییەکانی شنەی شەماڵو فڕینە**

**باڵندەییەکانی عەشق ببینە**

**ئومێد/ لەناو خەونەکانی زیندەگیت، کەژاوەیەکە لە هەناسەی**

**بە تریفەبوونی ئەو بارانەی کە تائێستا لە هەوارگەکانی**

**تەمەنت نەباریوە**

**ئیدی کوا بەخشش و مژدەکانت ئەی پاکیزە...؟**

**کوا هەناسە تاڤگەییە شەپۆلاوییەکانت- لە شەوە نافوورە**

**بلێسەییەکان**

**وەرزە بەرسیلەییەکانی باراناویت لە بناری لەپی دەستەکانت**

**شکۆفەی کردووە**

**دە بۆ دواجار خۆت بتەکێنەو با رووت ببیەوە لە گوناه**

**لەنێو خەونە بازنەییەکانی ئایندە/ هەناری وەرزی**

**توانەوەت پیٚ دەبەخشیم**

**لەنێو گەمە دۆزەخییەکانی ئەمڕۆش، گەردانەیەك لە ماچ‌و**

**بزەیەك لە درەوشاوەترین گۆرانییە ترێیەکانی ئەڤین..**

**من جەستەیەکم لە فریشتەترین‌و شەونیمترین مەمکۆڵەکانی‌بەهار**

**لە گەردنی وشە سۆزاوییەکانی نێو نامەکانتەوە خەوتووم**

**شەکەریترین شەوم ئاشناکرد بەگوناهە باڵندەییەکان**

**یادگاریترین رۆژگارم توڕهەڵدایە/**

**نێو باخچە بیابانییەکانی مەرگ**

**تەرزە سەرابییەکان لەنێو چاوانی ئەلبومە گیاییەکانەوە**

**لە هەرزەترین رۆژانی عەشقە سپێدەییەکانی ئالأندم**

**تەمەنم بوو بە گەردەلوولێکی رابردوو لەناو شەبەقێکی نادیار**

**لەنێو قەسیدە ئاوییەکانم بەخشش‌و کۆششەکانی خۆمت بۆ**

**دەنووسمەوە**

**لەنێو سپێنەی چاوی باڵندەکانیش/ رۆژژمێری ئایندەمت**

پێشان دەدەم
من لە نەسیم نەسیمترم ئەی پاکیزە
لە سپێدە پیاڵەیەك وشە حەقیقەتاوییە بەفریناوییە
خۆزگەییەکانم
لە دەمەو ئێوارانیش لەنێو جێژوانگەییەکانی کەنار گوێچکەم
وەکو ئەسپە سپییە فیردەوسییەکان حیلەت دێت
لە پانتایی خەیاڵیش/ ئەستێرەیەکی درەوشاوەی شەوە
ئومێدەوارە
غەریبەکانی...

بەهەناسەم خۆت شۆڕبکەرەوە ببە بە بازنی خەونەکانم
دۆزەخیترین گەمە هەرزەییە رەونەقاوییە ساویلکەییەکانی
دەفتەری عەشق/ ناسنامەی سەرگەردانەترین زەمەنی
چیرۆکە شوومەکانە
رەشەبا گێژەلووکەییە پایزییەکان لە ئاست باڵا سنەوبەرییەکەت
دەچەمێنەوە
ئەم لەنجە پڕ لە نازە هەرەمییە زکماکییە، گۆرانییەکانی مەرگت
بۆ دەنووسێتەوە

**گویٚ له پرخەی کاتژمێرەکانی عەشقە بەردینییەکان رامەگرە**

**چاوەکانم تابلۆی مایکرۆسکۆبیترین گوناه دەبینیٚ**

**بێزارمەبە**

**عەشق ئافەریدەترین خەلآتە لە گەردنی ماسییە ئایندەییەکانی**

**خۆرەتاو**

**ئیدی لە راچڵەکینی وەرزەکانی سووتانم گەڕایتەوە**

**شوعلەی نێو شەونمە بەریئەکانت لە گەرووی خۆت داگیرساند**

**لەگەڵ فڕێدانی قۆزاخە نەورەسییەکانی ئاویش**

**سوێندت بەباران خوارد کە خیانەت لە چارەنووسی خۆر نەکەی**

**سوێندت خوارد ببی بەو باڵندەیەی چرکەکانی زەمەن بە**

**تاڤگە بەهارییەکان ببەخشی**

**باخچەکانت ئاودا : رۆژژمێری ئۆقیانووسەکانت بە دیواری**

**عەشق هەڵواسییەوە**

**بەسەر کیشوەرە سەهۆڵبەندانییەکان تێپەڕین/**

**تەحەدای رەشەبات کرد**

**ئەمە بازدانێك بوو لە تەمەنی گەردەلوولییە خەزانییەکانت**

**بەرەو کارێزەکانی**

**توانەوە**

ئەمە بازادنێك بوو لە رۆژگارە تاریکەکانی کێڵگە وەهمییەکان
بەرەو کەژاوە خەنەبەندانییەکانی پێکەنینی سێو.. ئەی پاکیزە
ئەم بازدانە شکۆفەییەت نەبا، پیردەبووی بە دیار مرواریيە
خەواڵووەکانی رۆحی شەو...
سەما بکە، سەما بکە، سەما بکە، شەنگەبیتر... ئەزەلیتر
سەما بکە دەی زێتر زێتر زێتر دەی دەی دەی...!

تا بەسەرهاتی شەوە سەرمەدییە سێڵاویيەکانی تریش بە
فرمێسکە
شادمانییەکان بنووسینەوە
ئەو شەوانەی تا بەیانی لەسەر سینگی قەدەر گۆرانیمان
بۆ دڵتەنگی خۆمان دەوت

## شەوی پێنجەم

بە ماچ دەرگای ژوورە تاریکەکانمان کردەوە
لەناو رۆحی زەمەنە پەروانەییەکان بووین بە ئەڤیناویترین رۆشنایی
گەلەرییەك لەراموسانیمان پێشکەش بە مردنە پەمەییەکانکرد

**ئەمشەو گەمەیەکی پێشبڕکێییمان لە تێکەڵاوبوونە رۆحییەکان سازدا**

**یەك، دوو، سێ، چوار...چوار...چوار...چوار!**

**تابلۆی تەمەنە هەرزەییەکان دڵی خۆیان ئاوەڵاکرد... لە دەشتە**

**کاکی بەکاکییەکانی توانەوە**

**سەما بکە/ ئەی کچە غەریبە ساویلکەییەکەی عەشق**

**ئەم شەو لە کاتژمێرەکانی ئەم قەدەرە لە شەپۆلانت وەردەدەم**

**رۆحی رووتت بە کاژە وەنەوشەییەکان دادەپۆشم**

**لە بێ دەربەستیترین و مەرگاویترین مەرگە ناوەختییەکان**

**تابووتەکانی دوێنێتم خستە نێو ئاتەشگەکانی دڵم !**

**بە سەمفۆنیای وەرزی توانەوەم ئاشنا کردی...!**

**سەمام پێ بکە**

**من ئەڤیندارێکی رۆژهەڵاتیم**

**نم نم بمتوێننەوە لەنێو ئاتەشە دۆزەخاوییەکەی شەوە گەرمەکان**

**بمنووسەوە/ لەناو هەناسەی سەفەرە گوڵ گوڵییە**

**قوڵینگاوییەکانی قەدەر**

**چی دەبێت گەر ئەمجارەیان کرانەوەی دەرگا و**

**پەنجەرەکانی عەشق**

**بەرووی شەوەکان و رۆژەکان و وەرزەکان و سەدەکان**

**هەتا هەتایی بێت**

**سەمام پیۆ بکە**

**تا شەوانێك دڵفرازیت پیۆ ببەخشم**

**ئەندێشە شەهوەتییە غافڵییەکان لە چیرۆکە جەهەننەمییەکان**

**جیابکەمەوە**

**من پەیامبەری عەشقم**

**بمبەخشن– دەرگای هاتنەوەی خۆمم لەنێو خەیاڵە بڕونزییەکانتان**

**بەداخراوی جیۆ هێشت**

**بەسەرهاتی توانەوەی سروشتو توانەوەی جەستە نەرمۆڵە**

**ئاوییەکانم بەچڕی دراستانەکان سپارد**

**سەمام پیۆ بکە ئەی کچە شەپۆلاوییەکەی ئەڤین**

**ئەی پەریترین سنەوبەر**

**بەخەندەی پاژنەکانی ئەو شەوانەت دەگەشێمەوە**

**بە لەنەجەترین مۆممان داگیرساند**

**خەیاڵە خەنەییەکانمان بە خۆرەتاوی عەشق خەنی کرد**

**خەرمانمان تەژی کرد لە خۆزگە ئەفسوونییەکان دەبێژە دەی..!**

**با شەوگارستانەکانی نێو دارستانە تۆفانییەکان رۆشن ببنەوە**

**به رۆشنایی شەوە گەرمەکانمان**

**دەبێژه دەی/ تەزبێحێك له رۆژگاره هەتیوه بێ نازەکانی تەمەنت**

**تا چرۆکانی وەرزی توانەوه قەشەنگتر بن**

**دەبێژه دەی/ تەنافێك له تاریکترین گوناهە ئاسمانییەکان**

**با نەسیمتربم له گەردنی ئومێدە ئەبەدییە ئالوودەییەکان**

**با مۆرتربم/ مۆر مۆر هەموو جەستەم له ساتە راموسانییە**

**مۆر مۆراوییە مۆر مۆرەکان...**

**چی دەبێت : با پیربین له پێناو وەرزە ئایندەییەکانی توانەوه**

**ئەو وەزرەی به عەشق شەوە گەرمەکانمان نەخشاند**

**ئەو شەوانەی رازە گەورەکان تیا له دایك بوون**

**من له بەهار بەهارترم،**

**سەراسیمەترین‌و بەخشندەترین‌و سەمفۆنیاترین وەرزی توانەوەمپێیە**

**له ئایندەش ئاویترم ئاویتر**

**چی دەبێت من هەموو ژیانم بەو عەشقە مەزنەم دەبەخشم**

**تۆش خۆت‌و عەشقە شێتانەکەی خۆت... ئەی پاکیزە...**

**ناوەڕاستی مارس تا ناوەڕاستی ئایاری 1999 تورکیا-نیدە**

# بەشی دووەم

لەم رەهێڵیترین و ئاتەشگەرترین  وەرزی توانەوەیە

تۆش بەم چەترە شکاوانەوە بەکوێ دەگەی..؟

کە هەموو رێگاکان داخراوبن

لەم سەفەری مەرگو فەنابوونە چۆن حەزە شەقار شەقاربووە چەپێنراوە

سڕسڕبووەکانی تەمەنت ئارام دەکەیتەوە

تـۆ کـە هـەموو جەسـتەت تـەنراوە بـە تەونـە جاڵجاڵۆکەییـە ئاوریشـمییە

گیاییەکانی عەشق

جەخار...

چیتر بەدوای فەرشە ئەفسوونگەییەکانی ئاسمانی خەیاڵ مەگەڕێ

هاوارە لە خۆمان / شەوە کەژاوەییەکانمان ئێستا چیرۆکە سەرابییەکانی

نێو رازە غوربەتییەکانن

ئـەی گـوڵ/ بەزسـتانی نێـو وەرزەکانتانـەوە  دیـارە کـە نـاتوانی گۆرانییـە

هەمەرەنگیە

پڕ لە رازو نیازە سۆزاوییەکانی قەسیدەکانم بڵێیتەوە

ئەو ملوانکە برونزیە ئافاتیانەش فڕێدە

**كە دەنكەكانی بەخەونە گەردەلوولییە تۆفانییەکان دەلاوێنییەوە**

**دە پەنجەرەیەکی ژوورەکەت ئاوەڵاکە و فڕینە تریفەییەکانم ببینە**

**تاریکستانەکانی ڕۆحیشت بە فرمێسکە سپیە روونەکانی هاوارەکانم بشۆ**

**ئـــەم هەناســـەو ئاینـــدە شـــەپۆلیانە بەدەریاچـــەکانی کـــام ئۆقیـــانووس دەگیرسێتەوە ... ؟**

**لمی بیابانەکانی سەرپشتی دەستەکانت قەوزەیان گرتووە**

**سەرهەڵبڕە چ بارانێك تۆزو غوباری سپێنەی چاوەکانت دەشواتەوە؟**

**نیگا بەراییەکانت خوناوی بەرائەتیان لێ دەباری**

**چ وەرزێکی سۆزانییە ئەم زریانەی نێوکاتژمێرەکانی سەرسینگت؟**

**چ رۆژێکی کوشندە بوو لە رۆییندا ئەو کاتانەی ماڵئاواییت لەو ژوورە کرد**

**کە خەریك بوو تیایدا ئاشنا دەبووی بە وەرزەکانی توانەوە.**

**کەخەریك بوو دەبووی بەباڵندەیەکی کازیوەی نێومەملەکەتی عەشق**

**بەڵام جەخار رشایتەوە /**

**لەگەڵ دۆزەخ و خوێن و تۆفان /**

**لەگەڵ گەردەلوول و رەهێڵە و زریان**

**ڕشایتەوەو سورەتی مردنت لە سەرم خوێند دارەبازەیەکت کردە دیاری بۆ تەمەنی منداڵیم .**

**ئەی پاکیزەکەم/ من پەیامبەری عەشقم**

پەیامە گەرم گەرمەکانی وەرزی توانەوەم پێیە .

من ناتوانم لە چاوەڕوانی ئەم مانگەشەوانەبم کە خۆیان دەرناکەون.

دەبێ/ بەدوایاندا بگەڕێم و بیاندۆزمەوە

ئەی کچە غوربەتاوییە شەوگارییەکەی ئەڤین

لەنێو ئەم برین و ژانە بەسۆیانەشمدا هێشتا

من ئەو کچە سۆزانییانەم خۆش دەوێن / کە لە شەوێکی سۆزانی چارەنووسیان درایە بەر رەشەبا .

من هەموو باڵندەو رووبارە سۆزانییەکانم خۆش دەوێن چونکە لەنێو کارێزی برینەکانی عەشق گۆرانی بۆ

پرشنگترین سپیدە دەڵێن .

چ وەرزێکی تەمەنمانە بەکەناری کام خەرەند شۆڕ دەبینەوە...؟

ئەگەر بە موحیبەتی کۆشکە چراخانییەکانی عەشق نەگەین ژیان چ مانایەکی هەیە...؟

دە دەرگایەك لە دەرگا داخراوەکانی دڵت بکەرەوە/ پێکەنینی بەفرە خەوتووەکانی نێو مەمکۆڵەکانت ببینە .

لەم نزارستانی مردنە نازانم بەکام ئاوێنە سەیری روخساری خۆت دەکەی ...؟

ئەی بووکە بێ لانەکەی شەوە گەرمەکانم..تارا سپییەکەت بە پەنجەرە گەورەکانەوە
هەڵواسراوە/ جەخار ئێستا
ڕوخسارت ڕەنگی مردنی گرتووە لەنێو وەرزە ڕەشۆکییە پایزییەکانی عەشق .
داپۆشە بە پاکیزەیی ئەو دار سنەوبەرەی گۆرانی بۆ مرۆڤە ماندووەکانی عەشق دەڵێ.
ئەو مرۆڤە عاشقانەی / سەوزایی بەهارو بریسکانەوەی ئەستێرەکانیان بە مێژووی
شەوەکان ئاشنا کرد .
ئەم وەرزە وەرزی ئەبەدیەتی من نەبوو نا.. باڵات لەژێر گەڵاکانی غوربەت داتەکێنە
با ڕووت ببیەوە لە هەتاو .
ئەم وەرزە وەرزی دەرکەوتنی خونچەی شۆڕشی هەناسەکانی من نەبوو نا .
لەم دوورە دەستیەی نێو جەنگەڵستانەکانی شەپۆڵە دۆزەخییەکانی شەوە تۆفانییەکان
چ بارانێکە ئەم بێداریەی شەونموگیا..؟
چ گێژەلووکەیەکە هەناسە گەرمەکانی ڕووبار..دە ئاوێنەی ڕوخسارت بدەرە

بەربارانە خۆرەتاوییەکەی هەناسەم .

ئـای کـە نـاتوانی چـیتر بێـداری رووبـار لەسـەر سـینگی چـرکە بێداریـە بەریئەکانی مەمکۆڵەکانی خۆت بخەوێنی

تەنهایی شەویش بە تەنهایی وەرزە توانەوەییەکانی دڵی خۆت ژیر بکەیتەوە .

شـەوە گەرمـەکان بەسەرچـوون / ئێسـتا لانـەوازترن لـە کتێبـە رەنـگ زەردە مەزهەبییەکان

رشایتەوەو شەقامە خۆڵاوییەکانت گڕتیۆبەردا بە خەونە پەپوولەییەکان

رشایتەوەو دۆزەخێکی ترت بە ئاگر خوێندەوە

چ وەرزێکی تەمەنمانە...؟

هێشتا برینی پەراسووەکانمان ساڕێژ نەبوون

فێرە سەمای پێشوازی کردنی چەرخە بەردینەیەکی ترمان دەکەن

با پەردە لەسەر نهێنی شانۆگەرییەکان هەڵدەینەوە

گوێ لە نەغمەی نهێنی کەڤاڵێکیتر رابگرین

## شانۆگەری چوارەم

**له ئێوارەیەكی یەكجار رۆمانسیدا**

**چەند موسافیرێك لەسەر شانۆ دەردەكەون**

**ژاوەژاوی سەفەرو وەیشوومە سیحراوییەكانی عەشق تێكەڵاوی یەكتری دەبن .**

**دیمەنەكان یەك بەدوای یەك بەخێرایی تێدەپەڕن**

**دوو موسافیر ( وا پێدەچێ كوڕوكچێك بن )**

**لە باوەشی یەكتریدا گۆرانی بۆ یەكتری دەڵێن .**

**هەموو موسافیرەكان بە دەورەیاندا بازنەیەك دەكێشن**

**بینەرەكانیش دێنە سەر شانۆ/ ئەمانیش بەدەوری موسافیرەكان دا**

**چەندین بازنەی تر دەكێشن..تێكڕا هەموو دەبن بە كۆرس**

**((مەڕۆنەوە ئەمجارەیان كۆڕی عاشقانمان گەرمە**

**مەڕۆنەوە ئەم ژوانەمان دوا توانەوەی وەرزەكانە دوا رژانی شەهوەتە گەرمەكانی**

**ئەستێرانە. ئێرە مەنزڵگەی مردنی عاشقانە...))**

**ماڵئاوا موسافیرەكانم/ ماڵئاوا بینەرەكانم/ ماڵئاوا خوێنەرەكانم**

**ماڵئاوا عەشقە شێتانەكەی درەختو رووبار...ماڵئاوا...**

**تاکەی زریان بەپەنجەکانی من لە دایك بوونە نێرەمووکەکانی خۆی رەنگ دەکات.؟**

**تاکەی خەواڵوو بوونی ئەستێرەکان لە چاوی مەمکۆڵەکانی من دەخوێننەوە.**

**بڕیار بوو/ لەناو ئەم دۆزەخی توانەوەمان**

**وەرزی باران بهێنیە نێو گیانم تا ئاستی دڵفراز بوون– ئەی بەخشندەترین پاکیزە .**

**بڕیار بوو/ زمانی باڵندە شەونماوییەکانم فێر بکەی تا شەوانان سەفاتر بم**

**بڕیار بوو/ ملوانکە گیایەکانم لە گەردن بکەی تا ئاستی گەیشتن بە شەپۆلە بازنەییەکانی مەست بوون .**

**لە ئێوارەیەکی ئەسمەری/ نم نم نم نم نم نم**

**نم نم/قورئانەکانی رەشەبامان خوێندەوە .**

**لە بەهارگەی شەوە سپیەکانیشمان روانی**

**نم نم لاپەڕەی سوورەتە رەشەکانی مەرگمان هەڵدایەوە .**

**لە رووت بوونەوە هەنارییەکانی ئاومان روانی/ ئایندەی خۆمانمان خوێندەوە**

**بینیمان/ لەم زەمهەریربوونی زیندەگییە زەمەن جەستەیەکە**

**له تلياك**

**ڕۆيشتنەكان سەفەركردنن بەبەلەمی خورافە و**

**مانەوەش خۆخافڵ كردنە لەنێو دارستانە**

**جەنگييەكانی وەهم**

**بينيمان/ ئەو دەمانەی مسمان لەسەر سەری خۆرەتاو دەتواندەوە ... لەژێر تارمايی**

**ئـەم هاوكێشـە شەوگارسـتانيەمان بـەبێ دەنگـی ئايەتـەكانی عەشـقمان دەخوێندەوە .**

**له چاوەڕوانی فريادڕەسی شەوە بەخشندەييەكانی توانەوەبووين.**

**بەدەم بازبازێنی نێو سێگۆشەييەكانی وەهم/ دەستم بەبەر چركە گەرمـەكانی زەمەن كەوت**

**دەپێم بڵێ ئەی بەخشندەترين فريادڕەس**

**تۆ لەكام جنسی ئەستێرە درەختييەكانی...؟**

**دەپێم بڵێ ئەوانەی بە بەخشندەيی دەمرن**

**كام وەرز لە خەزانەكانی گيا تەڕ دەكەنەوەو كام بازنە لە دەوری گوناهەكانی شەو**

**دەنەخشێننو كام باخچە تەڕی دەكەن لە ماچ...**

**مــن هێشــتا بــه ئــاوی ســپێتی چــاوه ســۆزانییەکانی ئاینــده نەشۆراوم..مەمکەکانیان**

**لە خاچ دامو سینگیان تەژی کردم لە گەلاٚ وەریوەکانی مردن**

**هەر لەبەر ئەوەی کڕنووش بردنم بۆ فیرعەونی ئەو وەرزانە رەت کردەوە**

**کە بەخشندەیی تەنها بۆ درەختە پیرەکانە .**

**چ حیکمەتێکی تیایە بەمەرگ سپاردنی باڵندە شکۆفەییەکانی بەهار**

**من هێشتا لە دەرگا ئاوریشمیەکانی سەوزاییم نەڕوانیوە**

**دەمامکە سەرابستانییەکانی دۆزەخیان لەسەر کردم .**

**من هێشتا بەنێو کۆلاٚنە پێچاو پێچەکانی ئاو نەڕۆیشتووم**

**شکۆفە لیمۆییەکانی جوانیان سەربڕیم**

**من هێشتا رووت بوونەوەی خۆرەتاوم نەبینیوە .**

**لە شەوی لەدایك بوونی ئەستێرەکان/ نەزیف بوونی زەمەنیان پیٚ پیشان دام**

**ئیتر لەو رۆژەوە من هەموو شەویٚ لە خەونەکانم دا نەزیف دەبم**

**چ حیکمــەتێکی تیایــە خنکانــدنی شــەوە رۆمانســییەکانی نێــو قەســیدە توانەوەییەکانی هەنار**

**لــەنێو ئــەم خەڵوەتگایــەو ئــەم ســەفا مەحشــەریانەی دوای مەرگــە ناوەختەییەکانی بەر باران دەبەو دەستانەت بم شێلە...**

كــە پەنجەيــەكت لــە شــەونمو ئــەويتريان لــە شــيلە گولاڵەييــەكانی عەشــق
هاتوونەتە بوون
هێندە ستايشی دەمامكە ياقوتيە باڵندەييەكانی خۆت كرد
كەچی لەبەردەم ئاوێنەی مەراقەكانی حەزوو ئارەزووم
نەتتوانی تاريكی لەنێو شەوی دوای مردنەكانی بەر تريفە وەدەرنێی
دەبم شێلەو كوا نەسيمە فيردەوسييەكانت / لە چ وەرزێكدا هەڵدەكەن
ئەی پاكيزە...
وا خەريكە دەچمەوە نێو قۆزاخە ئێسقاناوييەكانی بەفر
من كاتێك وتم / گەلأيەكم لە درەختەكانی كۆچو ماڵئاوايیو پەريزادەيەكم لە
نيگا گەرمەكانی گوڵ
تۆ ستايشی بەهارت كرد .
بەڵام ئەی پاكيزە...من لەم بيابانستانی زەمەنەم/ ستايشی پايز دەكەم
چـونكە راسـتگۆ بـوو لەگـەڵ خەونـەكانم لەگـەڵ فڕينـەكانی بـەر گـەردەلوولی
هەناسەم .
بم گەڕێننــەوە/ بــۆ ئــەو رۆژە ميهرەبانييــە دڵفرازيانــەی كــە عەشــق لــەنێو
شادەمارە عاتيفەييەكانی
ڕەنگەكان لە دايك بوو .
لە مەراسيمی مژدانەی هاتنە دنيای عەشق دا

**سروشت سپێتی بە بەفرو سەوزایی بەگیاو زەردی بە خۆرەتاوو سووری بە ئەستێرەکان**

**بەخشی/ هەر لەم رۆژە گەرمانەی ئەم هاتنەمان .**

**ڕەنگەکان دابەشکرانو ئاویش ئارامیو هێمنی پێ بەخشراو موحیببەت لە دایك بوو.**

**هەر ئەو رۆژە ئەستێرەکان بەڕیز مارشی ئەبەدیەتی عەشقیان پێشکەش کردو پەلکەزێڕینەش**

**مۆنامۆی بەختەوەری داهێنا.**

**ئیدی مرواریو مەرجانەکانی سەر سینگت بۆنی ئەو رۆژەی لێ دەهات/ ئەی پاکیزە...**

**بۆچی فرێت دایە نێو رووبارە لیخنەکانی دۆزەخ ...؟**

**بۆچی ئەفسانەی موعجیزەکەتو یادگارییەکانت لەسەر پەڕەی گوڵەکانی رۆح نووسیەوە؟**

**بۆچی رەنگەکانت فێرە گۆرانی چیایی کردوماڵێکت دانا لە ئەستێرەو لەنێو گەلەریەکانی**

**جەستەشم تابلۆی خەونە پڕشنگییەکانی هەرزەییت نمایش کرد؟**

**ئیدی چ باڵندەیەك بوو تۆی گەیاندە سەرمانگی ئاسمانەکانی دڵم/**

**بەگازلێدانەکانی شەوانەت دیسان**

**گەردن و باسك و مەچەك و رانی خەونە ئەستێرەییەکانت**

**شین و مۆر هەڵگەڕاندم..مۆر مۆر مۆر..ئەی مرواریی مۆر مۆراوییەکەی عەشق**

**منیش لە فرمێسکە مۆر مۆرەکانی خۆمت وەردەدەم .**

**ئێستا هەموو جەستەت ئێستا رۆحی تۆش بە رەنگی مۆر رەنگ رێژکراوە**

**ئێستا دەمارەکانی سۆزت خوێنێکی مۆر مۆری لێ دێ...!**

**ئەی بەخشندەترین پاکیزە.../ بفەرموو**

**هەرچی کێوی سەخت هەیە هەرچی شەپۆل و گەردەلوول هەیە بۆت لە خاچ دەکەم .**

**دە بفەرموو ئەی سوڵتانی مەرگ و ئەی فەلەکناس و دوڕناس و خەزانناسی نێو چاوەکانی**

((**با**))

**من لە بەردەمت گوڵدانێکم لە رەنگە تاووسییەکانی بزە گەرمەکانی سەر لێوت و پیاڵەیەکم لە شەرابە جوانە ئەفسووناوییەکانی گوڵە لۆتسیەکان .**

**بم بەخشە ...**

من بەختەوەریت لە گەردنی گەزەنگ بۆ دێنم و خەڵوەتگەیەکیش لە سەمای مێروولە بارانییەکان من کانییە وشك هەڵاتووەکانی غرووبت پڕ دەکەمەوە لە سۆز...

دە بفەرموو با بە عەشقت ئەم کۆشكو باڵەخانە رەنگ مردوانەت عەتر باران بکەمو لە مۆمە رەنگاو رەنگەکانی پەنجەکانمیان هەڵکێشم/

دە بفەرموو دەی...

ئەی شازادەترین بەخشندە...ئەی پاکیزەترین مروارییە سەدەفییەکانی-ئاو-

## شانۆگەری پێنجەم

لەناو کۆشکێکی رازاوەی یەکجار چراخانی

کەسێك لە جنسی رۆشنایی لە ناوەڕاستی ژوورەکەدایە

دەنگێك کە دیار نییە لەچ لایەکەوە دێت.

-تۆ ئەی کوڕە ئەشقیای رۆژهەڵاتی

ئەی شازادەترین فریشتە ڤینۆسیترین گوڵەشکۆفەییەکانی فیردەوس

تۆ کە رووبارێکی لە میهرو درەختێکی لە عاتیفە

بارانە سێکسییەکان لە جەستەی تۆوە دادەکەن .

چـی تـۆی گەیاندۆتـە ئێـرە/ تـۆ کـە تابلۆیـەکی لـە عەشـق و لاوکێکـی لـە
وەرزەکانی توانەوە
دەبڕۆ سـەری بەکرۆکەی ئەهریمـەنیم بـۆ بهێنـە تا بەکرۆکە ئەهریمەنییـەکان
مابن
ئەویندارا‌ن بێ مراد سەردەنێنەوە
دەبڕۆ بەرەو ئەودیو دنیای ئەو تونێڵە بڕۆ
کە بەقەد تەمەنی سروشت دووروودرێژەو بەقەد شەوە قەترانییـەکانی بسـکی
رەشەباش
ڕەش‌و تاریکە .
ماینـە بەحرییـەکان لـە ناوەڕاسـتی تونێلەکـە لـە چاوەڕوانت دان گـەر پێیـان
بگەی دەبیت
بەباڵندەیەکی رەنگاڵەیی و بەسەرفرازی دەگەڕێیتەوە .
دەبڕۆ بە پاکیزەیی عەشقت دەسپێرم– پەردە دادەخرێ .

عەشق چ هێزێکی پەنهانە بۆ مرۆڤە ونبووەکانی کەنار دەریا
چ دەسـتێکی بەخشـندەیە بـۆ نووسـینەوەی پێشـنیهادەکانی ئـەو مێـژووە
سپیەی
مەزندەی هاتنی لێدەکرێ .

**لێم گەڕێن/ با هەر موریدی مەیخانەکان بم**

**چەندە جوانن / بریسکانەوەو رۆشنایی**

**ئەو سووچە تاریکانەی عاشقۆڵەکان بۆ خۆیان بە تەنهایی لەوێندەرێ....**

**دەخۆنەوەو دەگریێن‌و شیعر دەنووسن...!**

**گەڕان بەدوای مێژووە سپییەکان پیاسە کردنە لەناو ناوەوەی قۆزاخە رۆشناییەکانی**

**ئەبەدیەت/ من بەدوای کلیلێکی ئاگراوی دەگەڕێم .**

**هەموو دەرگا داخراوە تاریکییەکانی شەوگارم بۆ بکاتەوە .**

**هەموو شکۆفە گرێدراوەکانی باران‌و هەموو بوخچەی خەیاڵە ئارام بەخشە شیعراوییەکانی**

**ماسیە پرتەقالیەکانیش...!**

**من ئەمجارەیان لە دەروازەکانی ئاو دەچمە ژوورەوە .**

**لە سەدەکانی پێش هاتنم رادەمێنم/ بە رۆشنایی دروست بوونی رەنگەکان خۆم دەرازێنمەوە**

**سەیری شەڕی مان‌و نەمانەکانی دوێنێ دەکەم .**

**سلاو..ئەی سەرکەوتنەکانی جوانی..**

**ئەی پەیژە ئەندێشەییەکانی بوون**

**سلاو..له شکۆمەندیت ئەی مەمکۆڵە جاویدانییەکانی عەشق.**

**سـلاو..ئـەی سـەربازە ونـەکانی ئـەم شۆڕشـە، تاجـە گوڵینـە تراویلکەییـە ئەستێرەییەکانی**

**ئەبەدیەتی عەشقتان پیرۆز بێت .**

**سلاو..ئەی پێشڕەوە باڵندەییەکانی وەرزی توانەوە .**

**لــەم هاتنــە کەژاوەییــە بەربارانیــەم گــەر ئــەمجارەیان پێتــان بگەمــەوە مەمکۆڵەکانتان**

**لە تریفەی شەوەکانی خۆرەتاو هەڵدەکێشم .**

**با وێران کـەین ئـەو مۆزەخانانـەی کە کاتـژمێرە ژاکاوە رەشـە قەوزەییـەکانی تیا هەڵگیراوەو**

**ئایندەی عەشق ناخوێنێتەوە .**

**بـا رێگـە لـە بـارینی ئـەو کڵـۆ بـەفرە بـێ ئامانانـەی نێـو مۆمیاسـتانی ئـەو خەڵوەتگەیە بگرین/**

**کە لە مژدانەی شکستەکانی وەرزی توانەوە دا دەکەن .**

**ئەی پاکیزەترین بەخشندە...**

**من هاتووم و پەیامە گەرمەکانی عەشقم پێیە .**

**هەموو رێگاکان و هەموو تونیلگە قەترانییەکان و هەموو سەدەکان و رۆژەکان و شەوەکان و**

گەزنگە بەیانییە ئایندەییەکانیشم پشکنیوە .

لێم گەڕێ ئەمشەو بە سەما رۆژهەڵاتییەکەم...

بدرەوشێنمەوە ئەستێرەکانی سەر گۆنات بەڕەقس بێنم پەلکە زێڕینەی ناو چاوەکانت

من پەیامبەری عەشقم ئەی دڵ بەخشندە...

لێم گەڕێ ئەمشەو بە سەما رۆژهەڵاتییەکەم پەیکەری چەمانەوەی خۆمت بۆ بتاشم

دوای خەوتنی ماسیەکان و باڵندەکان و شەپۆلەکان و هاژەی تاڤگەکانیش

گوێ لە رازە شەونمییە پەنهانییە هەڵگێراوەکەی هەموو چەرخەکانی دڵت رادەگرم .

چەرخە بەردینەکان، ئاوییەکان، درەختییەکان، ئاگرییەکان، کریستاڵییەکان، برۆنزییەکان،ئێسقانییەکان، ئەشکەوتییەکان، لماوییەکان، ئیسفەنجییەکان......

ئەی پەریزادەترین پاکیزە...

لێم گەڕێ ئەمشەو/ بە مەمکۆڵەکانت ئایەتەکانی عەشق بنووسمەوە .

بەرگەکانی ئەم کتێبە پیرۆزەم لە رەنگە شینە فستقاوییەکەی چاوەکانت وەربدەم . پەڕەکانی ناوەوەشی

لــه زەردی قــژە خاوەكــەت هەڵكێشــمو بەســووری گۆناشــت ســەرەدێڕی ئایەتەكانی پێ بنووسمو

بـە ئەفسـووناوی بـالاّ ڤینۆسـییە بەیاتریسییەكەشـت نـاوەرۆكی ئایەتـەكان بنەخشێنم...!

من هەموو تەمەنی خۆم بە عەشقێكی مەزن بەخشی.. شەوە گەرمەكانم بە وجوود هێنا بەهارو پایزو هەموو وەرزەكانم فێری توانەوە كرد.

ڕۆحی عەشقم بەڕووتی لەسەر شەختەی كات ژمێرە بەستەڵەكییەكان رەسم كرد .

من پەیامبەری عەشقم/

باڵندەیەكی گەڕیدەیی نێو ساتە پەروانەییەكانم.. وێڵم بەدوای دەروازەكانی موحیببەت

خەرەندە ئافاتیەكانی سەر ڕێگاشم هەر نابڕێنەوە.

ئیـدی شـەوانێك فرمێسـكەكانی مـانگ رژایـە سـەر درەختـەكانی رۆحـمو لـەو رۆژەوە

خەزانەكانی عومرم لەدایك بوون .

لەدایك بوونی مردنەكان دەستی پێكرد.

هـەموو كێوەكـانو كانیـەكانو درزەكـانو گەلەریـەكانو بازنـەكانی هەناسـەم پڕبوون لە بەفر

**ماندووم لە مەملەکەتی شکستەکانەوە هاتووم/ تێکشکانەکانی هەموو چەرخەکان و وەرزەکان و باخچەکان و کۆمۆنەکانم بینیوە .**

**دواجار لە گەرمەی گەمەکانی کۆمۆنەی وەرزەکانی توانەوە / شکستی گەمەی**

**شەپۆلەکانی رۆحی خۆمم بینی.**

**کە سێوێك لە تەمەنی منداڵیمی هەڵوەراند**

**گەڵایەکی رۆشنایی لە شەقامەکانی مێژووی ئایندەمی کوژاندەوە.**

**لەگەڵ هاوارەکانم/ شەونم و گیا و پەرەسێلکەکان و کوکوختییەکان و ماسییەکان و بەفروباران و**

**هەموو خێڵە خوێن گەرمەکانی عەشقم بەخەبەر هێنا.**

**چاومان بریەوەترووسکاییە بەیانییە نەهاتووەکان و کەوتینەوە ری..**

**دیسان هەموو/**

**دەشتەکان و کێوەکان و شاخەکان و کیشوەرەکان و دەریاکان و ئۆقیانووسەکانم بری**

**تا بە مەنزڵگەی پڕ لە نووری تۆ گەیشتم.**

**بەرلەوەی بگەمە خزمەتت پێیان وتم :**

نەكەی لە گڕو بڵێسەی ئەم نوورە نزیك ببیەوە ئەوە گڕی خۆرەتاوی شای پەریانە

چەندین ساڵە هەزاران ئەشقیا گیانیان لە پێناوی‌دا بەخشیوە ... !

ئەوا من بەناو گڕی ئەم نوورەی تۆدا هاتووم‌و گەیشتوومەتە بەردەمت .

دە لێمگەڕێ تەنها ئەم شەو ..

بە سەما رۆژهەلاٌتییەكەم بەختەوەرو سەرسامت بكەم لە نیوە شەویش

لەكاتی شەو راكشان

لەتەك مەمكۆڵە بەرسیلەییە سێكساوییە بەیاتریسییەكەشت

شكستەكان و گەمەكان و رازەكان و خەونەكان و مردنەكان و فڕینەكان و

چیرۆك و حیكایەت و

داستانە ئەڤینییە ئەفسانەییەكانی خۆمت بۆ بگێڕمەوە .

–شەوی بەیەكتر گەیشتنی شای پەریان‌و كوڕە ئەشقیای رۆژهەلاٌتی:

پۆلێك پەری وەدەركەوتن

هەموو رەنگی فەرشەكان‌و بریسكەی چرایەكان‌و دۆڵفین‌و سالمەن‌و شارك‌و

ستارفیشەكانی

**نێـو حـەوزی ناوەڕاسـتی ژوورەکـە لەگـەڵ لەنجـەو گۆرانییـەکانی نافورەکـە هاتنە سەما**

**پـەریان رۆشـناییان لێ دەبـاری: جەسـتەیان کانیـەك بـوو لـە حـەزو ئـارەزووە سێکسییەکان**

**نم نم لەگەڵ هارمۆنیا و مۆسیقای راکشانی شەو ئەمانیش رەقسی پەریانـەی خۆیان**

**دەست پێ کرد**

**شای پەریان لە یەکێك لە دەرگاکانەوە بەدەرکەوت**

**پەریان لچکە کراسیان بۆ هەڵگرتبوو...**

**بە ئەستێرانیش دەورە درابوون**

**چ کەڤاڵێکی ئەفسووناویو دڵگۆشکەرە ئەم دیمەنە...!**

**شـای پـەریان لـە عاشـقۆڵە ئەشـقیا رۆژهەڵاتییەکـەی خـۆی نزیـك کەوتـەوە .. نزیك نزیك**

**ئەستێرانیش لەچواردەوریان دا تارایەکی سووری گەشیان نەخشاند**

**کوڕە ئەشقیاش لە دوڵبەرەکەی نزیك کەوتەوە .. نزیك نزیك**

**جەستەیەکی ئاگراوی/ نەرم نەرم ... نەرم نەرم نەرم**

**سینگو مەمکۆڵەیەکی/ سپی سپی ... سپی سپی سپی**

**سیما و بزەیەکی/ گەرم گەرم ... گەرم گەرم گەرم**

**تێکەڵاوی یەکتری بوون , بەجەستە بەدڵ بەرۆح بەگیان بەهەموو دەمارەکانی**

**سۆزو ئەوین**

**چ وەرزێکی تەمەنمانە...!؟**

**دەبا پیربین بە دیار ئەو ئایندەیەی خۆرەتاو لەسەر سینگی رووبار**

**پێدەکەنێ**

**دەبا لەکەنار ئەو ئێوارەیە رابکشێین کە نیگاکانی مانگ خۆی لە قەدو باڵای**

**بنچەگیا و**

**گوڵە هەناریەکان دەئاڵێنێ و بارانی شەهوەتە بریسکەییە نەغماوییەکان دا**

**دەکەن**

**ئەی شۆخ/ ئەی زنجیری دەست و دڵ و هەموو ئیحساس و بیرکردنەوەکانم**

**دەبا تەنها شەوێك لەنێو خۆڵەمێشی ئەو خەیاڵە پرتەقاڵیە زەنگیانەییانەی**

**ئومێدەکانم**

**بتخەوێنم...**

**تەنها شەوێك ببە بە بورجی شکۆفە جەهەننەمیە ئاگراوییەکانی ئاگرستانی**

**دڵم**

که جەستەیەکە لە خەڵووز

کوڕە ئەشقیا بەتاسەیەکی سنەوبەریانەوە لەنێو سەمفۆنیای چەمانەوەییدا

بەردەوام بوو ..

لێم گەڕێ/ با ئاگر لە تەنیایی ئەو ڕۆژانەم بەربدەم کە مەرگ کوشندەترین

سەردولکەی خۆرئاوابوونی تەمەنمی بۆم دەگوت

دەلێم گەڕێ/ با لەکەناری کۆتایی ئەم هاتنەم جارێکیتر بوونم بەجوانی و

بەمیهرەبانیت تەڕبکەمەوە

لەناو خوێنی دۆزەخی دڵۆپە فرمێسکەکانی سەر گۆنات سەر دەربێنمەوەو

بەڕۆشنایی باڵە پەپوولەییەکانی نێو چاوەکانت باڵابکەمو تائەبەد لەم

فیردەوسی

نەمریەم نەڕۆمەوە

کتێبە پیرۆزەکەم پڕدەکەم لە نووری بێگەردترینو کریستالیترین بزە

گولاڵەییەکانی

سەر لێوت

ئایندەم ڕەنگ دەکەم بەنووری چراخانی بەخشندەییت

ئەی پاکیزەکەم...

تۆ جەستەیەکی لە شکۆفەی ئەو نوورەی هارمۆنیای ئەبەدیەتت بەزیندەگی

بەخشی

سەرفرازمکەو سەمام پێ بکە سەما سەما سەما ئەی بەخشندەکەم سەمام پێ بکە

منیش پەیامبەری ئەو ئایندەیەم هاتووم / کە گلێنەکانیجوانی

لە شەڕی مانو نەمانەکان بپارێزم

مـن سپارتاکۆســی عەشـقم/ هـاتووم بـارانو گـوڵو دەریـا لـە کۆیلایـەتی رزگاربکەم

تۆش پێکهاتەیەکی لە تریفەی عەشقو خەونەکانی ئاو/

ڕۆژەکانی وەرزی توانەوەش لەنێو مەمکۆڵەکانت دەبریسکێتەوە

ئەی پاکیزەکەم...

ئایندەی جوانیم پێ ببەخشەو سەرفرازم کە بە دڵی پڕ لە رازمەوە سەمام پێ بکە

لەگەڵ تۆ/ ئایندەم پڕ دەبێ لە نوور... پیریم پڕ دەبێت لە سێو... بەهارم پڕدەبێت

لــە شــکۆفەکانی ئــارەزوو... زســتانم پڕدەبێــت لــە گولاڵــە ســوورەکانی هەتاو...ڕۆحم

دەبێتە جەستەیەك لە تریفەی نەمری...بالأشم دەبێتە کەڤالی چەمانەوەی عەشقێکی ئەبەدی

**ئەی پاکیزەکەم...**

**تۆ کەپرێکی پڕ لە سێبەر بۆ وەرزە گەرم گەرمە عاشقۆڵە خەوناوییەکانی من دەسەمام پێ بکە... سەما سەما سەما**

**من بووم ڕێگام لە رەشەبا گرت  نەم هێشت شەونمی بەیانیانت لێ بتۆرێنێ**

**مـن بـووم پەپوولـە بەفرینییـەکانی مەملەکـەتی لمـم بـە بەهەشـتگەی دڵـت ئاشناکرد**

**کاتێـك کـە رۆژەکـان بـەبێ دەنگـی رەت دەبـوون و خـەریك بـوو سـپێدەی رەنگەکانی**

**ڕۆحی تۆ دەمردن**

**من بووم سکێجی شێوەتم لەناو لـەپی دەسـتەکانم نەخشـاندەوە و بەگژووگیا سەوزایی**

**دڵی خۆم شەوانان لایلایەم بۆ دەکردی**

**(شای پـەریان لەگـەڵ کـوڕە ئەشـقیا لـە دەوری یـەکتری دەسـووڕانەوە دیسـان لەیەکتری**

**نزیك کەوتنەوە نزیك نزیك... سەمایەکی نەرمیان دەست پێ کردەوە)**

**شای پەریان بەچرپەوە وتی: ئیمڕۆ خۆشترین رۆژە لە زیندەگیم**

**چ ئارامبەخشییەکە جەستەو دڵی تۆ، چ ئۆقیانووسێکە پڕ لە راز چاوەکانی تۆ، چ شەوێکی**

**خامۆشە عەشقە خوماریيە دوڵبەرەکانی تۆ، چ شمشاڵی حەیرانێکە پەیامە پیرۆزەکانی تۆ**

**بم بەخشە/ خۆمو هەموو نووری رۆحی خۆمت پێ دەبەخشم، ئایندەمت پێ دەبەخشم،**

**باڵام...قژی خاوم...خەونەکانم..رازەکانم..مەمکۆڵەکانم لەنێو دەستەکانت دان**

**بەعەتری نەمری عەتر بارانت دەکەم. رۆژێ سێ جار لە کانیەکەی عەشق**

**بەڕۆشنایی پەریان دەتشۆم.. تۆش رازەکانی دڵم مەشکێنە ئەی کوڕە شۆخە**

**پەیامبەرەکەی نێو جەستەم .**

**ئەی سەمفۆنیاترینو فریشتەترین دڵ بزوێنی نێو دەمارەکانیعاتیفەم**

**سوێند بەکتێبە پیرۆزەکەت دەخۆم کە سەری بەکرۆکەی ئەهریمەنیت بۆ هێنام**

**ئەنگوستیلەی تەمەنو ئایندەو عەشقو ناسنامەی خۆمت لە پەنجە بکەمو**

لە ئەبەدیەتی عەشقت هەڵکێشم...

ئیدی بە پاکیزەیی عەشقت دەسپێرمو بەنیازی دیدار

-شای پەریان لەبەرچاوان وندەبێتو کوڕە ئەشقیا بەتەنیا دەمێنێتەوە-

چی دەبێت من هاتووم دەرگای دڵفرازی سەدەکانت بۆ ئاوەڵا بکەم

دەمارە خەوتووەکانی غوربەتت بە مەشخەڵە بڵێساویەکەی دڵم بەسەمابهێنم

من هاتووم/

مەدالیەی مانگەشەوی بەهارگەی عەشقت لە گەردن بکەم

لە نێو کەژاوەی ماچ ئاینەدەم ببینیو بەفیردەوسی توانەوەش تابلۆی

شەوە گەرمەکان بخوێنییەوە

من ئەو ئەڤیندارە رۆژهەڵاتییەم/ هەموو ئایندەم بەتۆ دەبەخشم...بەکات

ژمێرەکانی

هەناسەمت دەسپێرم...

بەنیازی دیدار ئەی پاکیزەم...!

سەرەتای نۆڤەمبەری 1999 تا ناوەڕاستی جانوەری 2000 کەنەدا

# بەشی سێیەم

که گەڵاکان دەبنە گەردانە ڕەشەکانی شەو

ڕێگاکان بەکەژاوەی تارماییەوە

بازنە لە دەوری ئاو دەکێشن...!

چیرۆکی عەشقە گەرمەکان بە ئافاتی تەمەن ناوزەد دەکرێن

ئەهریمەنەکان دەبنە دەسکەگوڵی سەرمێز

لەناو گەمە سیحرئامێزە سێکساوییەکانی عەشقەوە هاتووم

هەر دەڕۆم/ تا خەیاڵیترین خوناوی خەونەکانم ڕووت دەبنەوە

هەر دەڕۆم/ تا لەسەر تاشەبەردە گەورەکانی کەنار سپێدە خوێناوییەکان

هەناسەی خۆزگەکانو شەڕەکانو مردنەکانو عەشقەکانو

لە دایك بوونەکانم دەخوێنمەوە

**پەیامە بلێساوییە شەپۆلاوییە مرۆییەکانی نێو ناخم بەمراد دەگەن**

**ئارەزوومە/ ساتەکانی ئایندەم بەو تریفانە رەنگ بکەم کە تائێستا،**

**نەهاتوونەتە بوون**

**بەدوای ئەو ئۆقیانووسەشدا دەگەڕێم**

**کە شەپۆلەکانی شەوانان ژانە عەشق دەیانگرێ**

**بەدوای رەنگێك دا دەگەڕێم**

**کە سروشت تا ئێستا نەیتوانیوە پەی بەنهێنی جوانییەکانی ببات**

**بەدوای دارستانێك دا دەگەڕێم**

**کە زیندەوەرەکان لەوێندەرێ لە جنسی پەلکەزێڕینەن**

**بەزمانی عەشق یەکتری دەدوێنن...!**

**ماندووم لەدووری دوورەوە هاتووم/**

**بم نۆشن/ لە پێکێك شەرابم هەڵکێشن...ئەی خۆڵەمێشیترین رۆحی ئەو عەشقەی**

**لەنێو ساتە ئەستێرەییەکانی غوربەت**

**چارەنووسمت تەسلیم بە جەنگە گەورەکانی ئایندەکرد**

**بم لاوێننەوە/ ئەی بریسکەدارترین سێوی ئەو باخچەیەی**

کــه بەشــەهوەتە گەرمــە کازێوەییــەکان گوناهــەکانی ئــەو عەشــقەمان
دەنووسێتەوە
لەنێو تاریكو گەزەنگی ئەو بەیانییە راکشاوم/ کە مەرگ بۆ من سەفەرێکی
چاوەڕێ نەکراو بوو
زەمــەن لــەناو بزربــوونی خــۆی بــەدوای مێــژووە ســپیەکانی جەنگــەڵێك دا
دەگەڕێ
کە لەوێندەرێ هاوکێشەکانی عەشق شیتەڵ دەکرێن .
زەمەن لە سەرخۆشیترین چرکەکانی مردن لەگەڵ باران
پێشنیهاد نامەیەکمان بۆ دەنێری و تیای دەنووسیٚ...
مژمژەی مژدەبەخشەکانی ئارامی کۆتایی هات
هاوارە لە خۆمان ئایندە بورکانێکە لە کارەسات...!
ئەوە دنیایە/ ئەگەر دەرگای ئومێدەکانم داخرانو هاتنەوەم بوو بە پووشو
پەڵاشی
نێو کۆڵانەکانی رەشەبا .
ئیدی بەدەم  وڕێنەی ئەم بزربوون و خۆکوشتنەم
چ لە پیاڵەی تەنهاییم دەکەی/ ئەی گوڵەباخ...؟
ئەم جارەیان چ گۆرانییەکم بۆ دەڵێی...؟

**چاوەڕوانم بە ئەی پاکیزە.. فرۆی ئەو بەیانیە بێگەردەشم بۆ بنێرە**

**کە شەوە سوورەکانم بەلەنجەترین وەرزیان ئاو دەداو کازێوەش هەناسە**

**بێ ئۆقرەییەکانی من . هێمنی ئەو ئێوارەیەم بۆ بنێرە کە گورزە تیشکە**

**خوێن گەرمەکانی خۆر**

**بە چەمانەوەیی ماڵئاواییان لە جێژوانەکانی منوتۆ دەکرد .**

**خامۆشی سەمفۆنیای ئەو شەوانەم بۆ بنێرە**

**کە تا بەیانی خەونەکانی خۆمانمان بە دەمارەکانی عاتیفە دەنەخشاند .**

**وەرزە خەنەبەندانییەکانی رۆحی خۆتم بۆ بنێرە /**

**کە لە ناو خوێندنەوەکانم خۆت بە بووکی خۆزگەکانم هەڵدەواسی .**

**لە زیندانێکت دەخستم بە دوامەوە قوفڵت لە حەوت دەرگا**

**دەدا .**

**بەکاژی شەوە سێکساوییەکان داتدەپۆشتم**

**بە مەمکەکانیشت دەتشێلام .**

**ڕازەکانمت دەخوێندەوە ...**

**بە کتێبەکانی باران و حەیرانە دەروێشییەکانی شنەی با .**

**هاوکێشەکانی خەیاڵمت شی دەکردەوە**

**بە ئایەتەکانی شەونم و سەوزایی و هەندێ جاریش گۆرانییە پایزییە**

سەر خۆشبووەکانمت بۆم دەگوت .

چاوەڕوانمبە ئەی پەریزادە گیان .

دەزانم ئێستا نم نم، تك تك، دڵۆپ دڵۆپ

خوێن لەیادەکانت دەچۆڕێ / من خەون دەبینم لەنێو ئاوێنە بەهارییەکانی

ئەو تەمەنەی زۆزانیترین چیرۆکمان دەنووسیەوەو

درەوشاوەترین مانگمان رەسم دەکرد .

رۆژگارە لوولدراوەکانی عومرم کۆکەرەوە من خەون دەبینم

لەنێو رۆحی جەستە نەسیمییە تەرزەییە کاتژمێرییەکانی وەرزی توانەوەمان

.

لێم نەگەڕای/ خۆم بە سوخمەی چارەنووسێکی سپی

پەسارد بوو

ئەم رێگا پڕ لە هەورازو نشێوەی ئێستام

پەرداخێك لە جنسی پیر بوونی بەهارم پێ دەنۆشێ .

پەلکە زێڕینەی حەزەکانم بە تەناف هەڵدەواسێ

خەیاڵە جوانییەکانی ئەڤینیم لەنێو دارەبازەکانی گوناه بەند دەکات .

چاوەڕوانم بە ئەی گوڵەباخ...

کە رووبارەکانی عەشق تێکەڵ بە ئۆقیانووسەکانی ئەبەدیەت دەبن

**کۆشکێك لە زەردەخەنەو تاڤگەیەك لە خۆرو کانیەك لە ڕووناکی دەردەبن**

**ئەی ئەڤینم شۆڕشە جوانییەکانی تۆ نەبا**

**نەم دەتوانی لەم سەفەرەم مردنی خۆم لەنێو غروورپبوونی زەمەن و**

**سەرخۆشبوونی سروشت بدۆزمەوە .**

**ئاوێزانمبە من تازە بەتازە لە فەلسەفەی سەما ئەرخەوانییەکانی گەڵای**

**ئومێدەکانم دەگەم .**

**کە لەیەك چرکەساتی زەمەن هەم لێوی پایزو هەم لێوی بەهار ماچ دەکەن .**

**پەریزادەکەم /**

**نە ڕەهێڵەو زریان  نە ڕەشەبا و تۆفان  نە ئافاتیە ئاسمانییەکان**

**هیچ مەرگ و مردنێك ناتوانێ پەپوولە ڕەنگاڵەییەکانی خەیاڵم بەند بکات .**

**من چرۆی شۆڕشی ئایندەیەکی ترم**

**ئایندەیەك ...**

**هەموو بوخچە تاریکییەکان و دارەبازەکان بسووتێنێ**

**شۆڕشە شۆڕش/ کەرنەڤاڵێك لە دەمارەکانی عاتیفەم دەبزوێ .**

**دەرگاو پەنجەرەکانی دڵتان بخەنە سەر گازەرەی پشت/ من خەون دەبینم**

**لەنێو سکێجی ڕووباری حەزە سپیە نوورانییەکانی مندالأندام .**

**کە ئایندەیەك پڕ لە باخچەو گەمەو زەردەخەنەیان بۆ دەهێنمەوە .**

**هەر دەڕۆم/ تا بە کەڤاڵێك لە شەونمی جەستەو خەیاڵە ڕەهاییەکانم دەگەم .**

ئیدی ئەوە ترۆپکی سەرکەوتنەکانی جوانییە...لەوێندەرێ

هەموو دارستانەکان‌و بەیانییەکان‌و باران‌و گوڵ‌و باخچەکانم متوربە دەکەم

.

گاڤ گاڤیش ئەلبومێك لە ساتە شەرمناوییە شەڕانگێزییە

ڕەش ڕەشەکانی

مردنی خۆت‌و کارێزێك لە هەناسە گەرمە پڕ لە عەشقە ئەستێرەییەکانی

خۆمت بەبیر دەهێنمەوە .

ئەوە منم/ جوانی سێوم بەتەنافی هەناسە لیمۆییەکانم گرێداوە

ڕووباری ئەو شەوە سێکساویانەم لەگەڵ خۆم دا هێناوە

کە ڕەنگە سروشت لەمەودوا هاوکێشەی پێکهاتەکانی خۆی بگۆڕێ‌و

پەیکەرێکی‌تر بۆ ناسنامەی خۆی بتاشێ .

ڕەنگە لەمەودوا پرسیارەکانی دوای شەڕە خوێناوییەکان زیاتر بن .

ڕەنگە لەمەودوا مردنی گەڵا زەردە خەوتووەکان لەشەوە ئەنگوستە

چاوەکانیش دا ببینرێ .

ئیدی/ ئەو مەمکانەی تاکو ئێستا لێوی

هیچ خونچەیەك

هیچ کاتژمێرێك نەی مژتووە

دەبێ ئێستا چ پرسیارێك لەناو جێگای شەوانەیان جێبهێڵن ؟

دەبێ چ شۆڕشێك لە ئایندەدا هەڵگیرسێنن‌و چ چرایەك لە چراخانی عەشق هەڵکەن...؟

میوانم بە ئەی گوڵەباخ /

من بە ئومێدی تۆوە خۆم داوەتە دەست ئەم قەدەرە

من بە ئومێدی تۆوە

دەڕۆم‌و بێستوونیترین کتێبە جوانەکانی عەشق بە فرمێسکم دەنووسمەوە

من بە ئومێدی تۆوە دەڕۆم و

بەنیازم بۆ چرکە توانەوەییەکانی با دەرگای مێژووە داخراوەکان بکەمەوە

میوانم بە/

من دڵی گەورەی مەملەکەتێکم پێیە کە هەموو شەوێ لەنێو لەپی دەستەکانمدا

دەسووتێ.

ئەو مەملەکەتەی لە بەیانیەکی خەواڵوو خەونەکانی پیر دەبوون‌و

لەگەڵ سەرەتای وەرزە پرتەقاڵیەکانیش/ لە دایك دەبوونەوە .

من ئێوارە هەنارییەکان‌و رازە لیمۆییەکانی ئەو شارەم جێهێشتووە .

کە پەڕەسێلکەکانی بەرائەت دەمێکە لەوێندەرێ سەربڕاون...

مەراقە سێویەکانیش لەنێو بەلەمەکانی کەنار دەریا مردوون .
ڕۆحێکی هەلاهەلای زەمەنێکی ژەنگاوییە ئەم سەفەرەم
ئەوە چ برینێکی گەرماو گەرمە ئەم عەشقە پڕ تاسە بولبولیەم گوڵگوڵیەم
کە/ تك تك..نم نم..دڵۆپ دڵۆپ..خوێنی لێ دێت .
ئەوە من بووم /
ملوانکەیەك لە سێبەری گۆرانییە خۆشبەختییە دڵفرازییەکانم
لەگەردنی ئەو بەیانییە کرد
کە تا ئەو ساتە شەوانی وەرزە توانەوەییەکانی نەبینیبوو .
ئەوە من بووم /
مانگم بەتەنهایی خۆیی و عاشقەکانم بە مردنەکانیان ئاشنا کرد .
بەهەشت/ گەلەرییەکە لە گوناهو خەون بینینێکە بە زەمەنە سێکساوییەکان
پایزیش/ گەمە ئاگراوییەکانی سەوزاییە لەسەر لاشە مردووەکانی
ئەو گەڵا هەڵوەریوانەی کە ئەلبومێك لە کات ژمێرە شەپۆلاوییەکانی رووباریان
هەڵگرتووە .

لەو رۆژەوەی مێینەی سروشت و منداڵێتی زەمەن لەخاچ دەدرێ
ئومێدە گەورەکان بوونەتە هەیکەلە ئاسنینەکانی بەردەرگای دۆزەخ...!

من خەون دەبینم  تۆش میوانم بە
دەگەڕێمەوەو لە پێشوازیم بە/ بەو ئومێدە ئاگراویانەم بوو
کە پەڕپەڕەی سەدەکان و وەرزەکان و ئایەتەکانی مێژووم هەڵدایەوە
تا شەهێنێك لەبەر پەنجەرەی شەوەکانی خەیاڵم بنیشێ .
خەیاڵە رووت رووتەکانی ساتە شەرمناوییە خۆکوژییەکانی هەرزەییم
لە پێشوازیم بە...
سروودێك بۆ قودسیەتی شەوی پەردەو دووربینێك بۆ رازە کۆمۆنەییەکان و
توانەوەی نێو ئامێزی عەشق و سەمای ئاوێتەبوونی بەرپەنجەرە گەورەکانی
شەوە خامۆشەکانت بۆ دەهێنمەوە .

کە شەپۆلەکانی هەناسەت / لەم شەوگارستانە کەژاوەییە غوربەتییەم
بەلەمە ئەفسوونگەییەکانی رۆحی منی جێ هێشتووە .
وا پێدەچێ چیتر دەستاڕی برین و یادەکانت نەهەژێنم
نازانم ئەوە یاخی بوونی منە یان غووربوونی زەمەن
چ روودەدات گەر تا ئەبەد لەنێو سەدەفە بێدەنگییەکانی ئەم بەرئەنجامەم
خۆم حەشاردەم .

**مـن لـەنێو رەنگـە پەلکەزێڕینەییـەکانی چاوەکانت باخچـەیەکم هـەبوو پـڕ لـە ترێ**

**من لەنێو بەهاری لە دایك بوونەوەت خەون دەبینم**

**وەرزێك لە رۆژە دۆلفینییەکانم دەژمێرم/ سەدەیەکیش لە شەوانی**

**بە پاکیزەبوونی عومری خۆمت بۆ پۆست دەکەم .**

**گۆبەرەیەکیش لە شەڕەکان و سەرکەوتنەکان و مردنەکان و کۆچەکان و**

**بوومەلەرزەو تۆفان و بورکان و هەموو داستانە پڕ لە عەشقە**

**ئەفسانەییەکانت بۆ دەنێرم .**

**مێژوو چ شپرزەیە کە لە شەوێکی سامالًی چواردەیی**

**نەئەستێرەکانی دەردەکەون نەتریفەی مانگ**

**گەر مێژوو دووبارە بێتەوە چ رازێکت پێیە بۆ ئایندە ؟**

**چ مۆنامۆترین**

**سەمفۆنیات پیًیە**

**بۆ سەمای ماسیە سوورەکانی نێو خەیاڵە سپیەکانی عەشق/ ئیدی**

**نم نم / بمگەڕێننەوە بۆ ناو باخچەی خەونەکانی منداڵیم**

**کە لەنێو کۆڵانە تاریکەکانی دڵتان جێمهێشتووە**

**ئەوە چ جوگرافیایەکە... ئەم بەرمۆدای مردن و کۆچ و جەستە شەقار شەقار**

بووەی ئەم رۆیشتنەم .

تا پێت دەگەمەوە دەبێ ئێستا /

بازنەی خەوی شەوە بێدارییەکانت لە چ رووبارێکدا بخولێتەوەو

چ پەیکەرێکیش رەنگ بکەن .

لە پێدەشتە تاراوگەییەکانی عەشق

دەبێ کۆلۆمبسەکان کەی مەملەکەتە ئەڤیناوییەکەی دڵمان بدۆزنەوە...؟

ئێمە لێرەین بەتاقی تەنێ...

قیبلەنومای شەوەکانمان بزرکردووەو رۆژەکانیشمان لەگەڵ بادا دەڕۆن

وا خەریکە زمانی بەفرو گەمە نەورەسیەکانی دەریاو سەما

سنەوبەرییەکانمان

بیردەچێتەوە .

وا خەریکە چیتر ماسیەکان لەنێو شەقامی شەپۆلەکانی شەوانەمان نابینرێن

ئەوە عەشقە لەوانەیە هەموو زیندەوەرەکان بەگومبەزە خۆڵەمێشییەکانی

جەستەیان بگەن و

ئەمیش لەنێو گەلەری دڵۆپە شەونمێك

هاوارێك لەجوانییەکانی خۆی نمایش بکات .

کێ هەیە بەخۆی بڵێ من عاشقم و

سواری فەرشە ئەفسوونگەییەکانی تەنهایی نەبووبێت و رۆژگارە تاریکە

قەترانییەکانی نێو ئەشکەوتەکانی مردنی نەبینیبێ...؟
لەت لەتم کەن/ جەستە پڕواپڕ لەخەیاڵە لێو بەبرینەکانم
دەمار دەمار، پەنجە پەنجە، گرێ گرێ، ئێسقان ئێسقان... لەشەقامەکانی شارو
لەدەشت و چۆڵەوانییەکانی رۆحتان بمگێڕن .
تا پێناسەیەکی تازە بۆ عەشق و باخچەیەك بۆ وەرزەکانی توانەوەتان دەست بکەوێ
هەلاهەلام بکەن...
هەناسەکانی عەشق لەنێو دەمارەکانی رۆحمایە
شیلەی گوڵ و شەونمی سپێدە و رێژنەی بارانە بەهارییەکان لەنێو پەنجەکانمەوە
خەوتوون .
ئینج بەئینجی دەمارەکانی عاتیفەم پێکهاتەیەکە لە هەوارگە سەوزەکانی نێو فیردۆسگە عەشقگەییەکانی ئەبەدیەت .
بمگێڕن/ لە کۆڵان بەکۆڵانی جەستە هەمیشە پاییزو هەناسە هەمیشە
زەمهەرییەکانتان .

لەهەموو کونج و کەلەبەرە تاریکەکانی دڵتان

دەمارەکانی مۆخم سەمفۆنیای ئێوارە ئارامیەکان و چاوەکانم

بیناییتان پێدەبەخشێ

ئەوە منم/ لەسەر لوتکەی شاخە هەرە بەرزەکانی عەشقەوە گۆرانی بۆ تەنهایی

خۆم و بۆ مەرگی شێنەیی ئێوەو بۆ بەرائەتی زەمەن دەڵێم .

چ سەفەرێکی ناوەخت بوو...

سووتاندنی کتێبە پیرۆزەکانی رۆژگارە مەمك شۆڕەکانی دوێنێت .

کە مژدەی لەدایکبوونی تەمەنێکی تازەو

پەنجەرەیەکی گەورە لەبەخت و کوپەیەك لەلیکی حەزە سێکساوییەکانی

پێت دەبەخشی .

بەسەر لاشەی رۆژگارە پەژموردەییەکان تێپەڕیم .

ویستم نیگارێك لە حیکمەتەکانی زەمەن

پێشکەش بەئەستێرە کوژاوەکانی حەزەکانت بکەم و کاتژمێرە ژاکاوەکانی

نێو مەمکەکانیشت بەخەبەربهێنم .

کە تا ئەو کات بێ ئاگابوون لەگەمە بازنەییەکانی شەپۆلی ئەو رووبارانەی

**چاوەڕێی بووی کە سوارچاکی خەونەکانت تیایدا دەربکەوێ .**

**چەند ساڵ بەدیار ئەم رووبارە شێلووانە تەمەنی خۆت ژمارد...؟**

**لەنێو خەرەندە تاریکەکانی شەو بەچ بیردۆزێك گەیشتی...؟**

**چ خوێندنەوەیەکت بۆ رەشەبا و بۆ گەڵا رەنگ زەردەکانی مردن دەستکەوت...؟**

**ئەی گوڵەباخ /**

**دواخوێندنەوە ئاگراوییەکانت نەبا پیردەبووی بەدیار لاشە تەماوییەکانی ئەو**

**مۆمانەی دەمێکە لەنێو کتێبەکانی بەهار کوژاونەتەوە .**

**دەمێکە ئەوانەی دەڵێن /**

**ئێمە بەلوتکەی بەختەوەری گەیشتووین .**

**گلۆرە بەنەکانی شەوە سوورەکانیان لەنێو دەریاچە قووڵ قووڵەکان بزرکردووە**

**دواخوێندنەوە بەتریفەییەکانی شەوە پاییزییەکانت نەبا،**

**هەرگز باریکەڕێی شەوە گەرمەکانت نەدەبینی و چیرۆکی**

**( تارای سپی بەر پەنجەرە گەورەکانت...) نەدەخوێندەوە...!**

**هەرگیز بەماچ سەوزاییت ئاونەدەداو سەفەرت بۆ نێو رەنگە جوانەکانی مەملەکەتی گوڵ نەدەکرد .**

**لێمگەڕێ با هەناسە ئاوییەکانی ئەو ڕۆژانەت ڕەسم بکەم**

**کە برینێك لەجەستە ئاگراوییەکەی هەتاویان ساڕێژدەکرد .**

**لێمگەڕێ با ڕستەیەك لەلاپەڕە چرپەییەکانی ئەو شەوانەت هەڵدەمەوە**

**کە تابلۆیەك دەنەخشێنن و ڕووبارێك لە باگراوندی دوێنێت تیایدا ڕاکشاوە**

**.**

**پێم بڵێ ئەی گوڵەباخ /**

**چ سەدەیەکت لەنێو بەلەمی هەنگاوەکانت هەڵگرتووە...؟**

**دەتەوێ بەچ وەرزێکی تری پڕ لە عیشوە و پڕ لە لەنجە تەماوییەکانت بگەی...؟**

**بەدوای خۆتەوە تابلۆیەکی جیوەییت جێهێشت .**

**پڕاوپڕ بوون لەو ڕەنگە تۆخە سادییانەی کە هەرزەییانە لە ئایندەی**

**سروشتیان دەڕوانی .**

**ئای خۆزگە دەمزانی بەلەمە سەوڵ شکاوەت ئێستا لەکەناری**

**چ دەریاچەیەك ئاودەخواتەوە .**

**ئێستا لمی کام بیابان لەخۆت هەڵدەسووی...؟**

**تۆ ئەی ئەو شنەبایەی بەناو ناخی برینەکانم تێپەڕیت .**

**کوا ئەو دەفتەرەی پڕبوو**

**لە خەیاڵە گەرمەکان و**

**خونچە گەرمەکان و**

**شەوە گەرمەکان و**

**فڕینە گەرمەکان و**

**توانەوە گەرمەکانی زیندەگیم...؟**

**کوا ئەو بەیانیەی کە هەر چرکەیەکی/ رووبارێك لە رازو مەشخەڵێك لە سروودە درەختییەکان و بەهارێك لەخەوە ئارامییەکانی پێم دەبەخشی .**

**بەنێو خونچە هەلاّڵەییەکانی رۆحم تێپەڕیت .**

**پێت نەگوتم...**

**چ وەرزێك/ وەرزی پشکوتنی چرۆی ئارەزووەکانی ئێمە بوو**

**حەیرانەکانمان بەچ شمشاڵێك بژەنین .**

**پێت نەگوتم...**

**کامە زنجیری رەشەبا بشکێنم دووردەکەومەوە لەحەرفە رەشە تاریکەکانی مردن .**

**ئەی گوڵەباخ / ئەمشەو چرایەکت بۆ هەڵدەکەم**

**پڕ بێت لە رووناکی گڕوگیا**

پڕ بێت لە هاواری ئۆقیانووسەکان
بۆ گەیشتن بەئایندە شەونماییەکانی زیندەگی...؟
ئەمشەو لە نرکەو ناڵە بەردەوامەکانی ئاو هاوکێشەیەکت بۆ دەنووسمەوە
کە فەلسەفەی هاتنمان شیبکاتەوەو گۆرانیش بۆ ئاکامەکانی عەشق و

ئایندە سپێدەییەکانمان بڵێ.
ئەی جەستە نەرمو نۆڵتر لەهەورە سپیەکانی ئاسمانێکی پڕ لە برووسکە
بەنێو دڵۆپە ئەسرینەکانی سەرگۆنام تێپەڕیت و پێت نەگوتم
نیگاکانی من بەختەوەرتر بوون یان حۆرییەکانی بەهەشتی خەیاڵ ... ؟
سێبەری بالآی من گەورەتر بوو یان تاریکی دارستانەکانی وەرزەکانی
نێو رۆحی خۆت ...؟
پێت نەگوتم نا...
مەرگی من گەرمتر بوو یان دڵی مرۆڤە دۆزەخییەکانی
نێو جەستەی رەشەبا ... ؟
چ وەرزێکی تەمەنمانە ئەم وەرزە ناوەختە...؟
ئەی گوڵەباخ /
دە سەمام پێبکە لەنێو کەژاوەی ئەڤینیم دەتۆش خەون ببینە
وەرە ئەی رۆحی من لە گێلآسە خەیاڵییەکانی بێهۆشیم دەرگای رۆژە

**بێدارییەکانت بکەرەوە .**

**بەچرکە سووربباوە مەمکە بێ ئۆقرەییەکانت باوەشێنم**

**بکەرەوە .**

**خەون ببینە/ بەو گوناهانەوە زریکەت بەزەمەن هێنا**

**بەو گوناهانەوە رەنگەکانی ئاگرت گۆڕی .. وەرزە ئارامییەکانی نەسیمت**

**سەرخۆش کرد .**

**چاوەکانی ((با))ت دەرهێنا.. گەڵاکانی تەمەنی ئاوت هەڵوەراند**

**بەو گوناهانەوە باڵندە هەستیارەکانت لە گۆزەی شەراب هەڵکێشا**

**بێستانێك لە تاریکیت بە هەتاوی عەشق بەخشی**

**رۆحی پاکیزەیی درەختت بەخۆڵەمێشی وەرزەکان شۆری**

**چ گوناهێکی ناوەخت بوو ئەم سەفەرە**

**لێرانە لەنێو مەمکۆڵەکانی سەحەریترین چرکە کریستاڵییەکان**

**بەدوای سەوڵێکدا دەگەڕێم کە تەوازنی جەستەم رابگرێ .**

**مەرگ بەئینجانەیەك لە گوڵی زەردو سوورو سپی... لەپێشوازیم دایە**

**باڵندەی غەریزەکانم کۆچیان کرد**

**منیش بەم هەموو گوناهانەوە ویستم باخچەکان لەخەوە خۆرهەڵاتییەکان**

**بەخەبەربهێنم...**

ویستم شەپۆلی نیگەرانییەکانی دەریا بڕەوێنمەوە . سێڵاوی
زەمەنیش بەتەمەنی کاتژمێرە ماندووەکانی نێو شیعرەکانم ببەخشم .
وەرە ئەی ڕۆحی من
بەشەمەندەفەری یادەوەرییەکانت بمبەرەوە
ئەمجارەیان بەسەبەتەیەك نان پێشوازی لەباران دەکەم .
بەسەبەتەیەك رووناکییەوە دەچمە میوانداری باخچەکان .
ئەمجارەیان لەنێو رووبارەکانی زەردەخەنەوە عومری خۆم بەسەر وەرزەکان
دابەش دەکەم .
خەونەکانم بەڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەی سەحەر دەخوێنمەوە
دێمەوەو نیگارێك دەکێشم... بۆ شەوە وەیشومەییەکانی پرسیار...
ناهێڵم کتێبی ژیاننامەی سێبەر لەمۆزەخانەی مردن دابنرێت .

دێمەوە سەمفۆنیایەك لەنهێنی ڕەنگەکانتان بۆ دەژەنم
بلوێرێك لەپێکەنینەکانی باران دروست دەکەم . کۆڵانەکانی رۆژەکانی
هەفتە لەتارایەکی سپی بەفریناوی وەردەدەم .
بەگوڵاو بەرپەنجەرەکانی دڵتان بەردەرگای ماڵی ئارەزووەکانتان
گۆڕەپانی شەهوەتە کورپەییەکانتان ئاوڕشێن دەکەم .
ئەی ڕۆحی من /

لێ نەگەڕای لەنێو سادەیی‌تەمەنە خۆرهەڵاتییەکەت سەربنێمەوەو فڕینەکانم

لەئەبەدیەتی رەنگی چاوەکانت هەڵبکێشم .

گوناهی من چی بوو .

لەنێو رووناکییە نارنجییەکانی وەرزی توانەوە باڵندەکانی تریفەی مانگت

سەربڕی .

لەنێو رۆژانە هەنارییەکان ئینجانە سەحەرییەکانی خۆت دایە دەستی

رەشەبا

شەوەکانی بارانت ئاشناکرد بەکاتژمێرەکانی گەردەلوول

زەمیلەیەکیش لەسێوی عەشقە حەسرەتیەکەمت لەنێو کێڵگەی وڕێنەکانی

زەرافەی سەدە مردووەکان بەجێهێشت .

دەوەرە ئەی رۆحی من/ بەشنەبای رۆحی پاکیزەییت بمبەرەوە...

دێمەوە/ نیگارێك لەفیردەوسی باران دەکێشم

تا رۆژگارە بێوەژنیەکانم بەزەردی زەردەخەنەو بەسووری سەحەر

خۆیان تەڕبکەنەوە .

نیگارێك لەسنەوبەرەکانی ئاو دەتاشم...

تا وەرزە هەتیوەکانی رۆحمان ئیدی لەژێر سێبەری سۆزو لەباوەشی ناز

رابکشێن

هەناسەی کەمانچەیەکی شکاوی ئێوارەیەك بەرابردوومانەوە دیارە

کە منداڵ بووین زمانی گوناهمان نەدەزانی

مەدالیەی دۆزەخیان لەگەردن کردین .

هێشتا بەرگی ئاوریشمینی نێو منداڵدانی بەهار لەجەستەمان نەترازابوو

بەهاواری لەخاچدانی رووبار رەنگە جوانەکانیان لەخەونەکانمان ترازاند .

هەناسەی کەمانچەیەکی شکاوی بەیانیەك... بەتەمەنمانەوە دیارە

کە نم نم لەژێر تاڤگەی ماچە گەرمەکانمان

هەتاومان بەپایزی عەشق دەبەخشی .

ئەی رۆحی من /

ئەو رۆژانەم بەبیرمەهێنەوە .

کە لەناو بێدەنگیمدا گریانەکانمت دەخوێندەوە . لەناو گریانەکانیشمدا

هەناسەی کەمانچەیەکی شکاوی ئایندەمت دەبینی...!

منیش بە گۆرانییەکانی پەلکەزێرینە

سەمەرست و سەرخۆش و دڵفراز دەبووم .

ئەم رۆژگارانەم بەبیرمەهێننەوە .. من خەون بەئایندەیەکی ترەوە دەبینم

ئایندەیەك ...

**خونچەکانی عەشق/ بەبەرائەتی دۆزەخ و بەپاکیزەیی فیردەوس ئاوبدرێت**

**ئایندەیـــەك/ هێشـــووە ترێیـــەکانی لـــە ئـــاگرو گـــەلأکانی لـــە بـــاران و دارسنەوبەرەکانی**

**لەبەفر بێت .**

**بەر لەو رۆیشتن و نغرۆبوونەم .**

**مەراقە سێکساوییەکانی خۆم لە کۆلأنەکانی ئاو دەگێڕا**

**بۆیە لەیەکەم رۆژی بەعاشق بوونم**

**مەمك وەك بنیادە بەنەفسەجییەکانی سێکس هەتاویترین و هەناریترین**

**وەرزیان پیێ بەخشیم**

**من لەکەنار رووباری خەیاڵە شەونماوییەکان راکشاوم و**

**لەپێدەشتێکی لماوی خەون بەگەمە منداڵییەکانم دەبینم**

**ئـەو رۆژانـە چـەندە جـوان بـوون .. کـە تەزبێحـە بریسـکەییە جوانـەکانی شەوەکانمان**

**دەژمارد و مردنەکانیش بەزیکرە دەروێشەکانیان لە دەورمان دا**

**بازنەیان کێشابوو .**

**کەچی هەر نەدەمردین / من ئێستا لێرانەم بەتاقی تەنیێ**

**دلۆپ دلۆپ، تنۆك تنۆك خوێن لەبرینی ئارەزووەکانم دەچۆڕیێ**

**من لێرانەم / تەنهایی شەو دەمنووسێتەوە**

**بێدەنگی ئاو، نامۆیی ژوورێك غوربەتی مانگ**

**حیلەی ئەسپێکی دابڕاو لێوی بەهارێکی نەهاتوو مەمکۆڵەیەکی پاییزی**

**لێرە رۆژەکان بۆ بەئافاتبوونی مێژوو دەمنووسێتەوە**

**لێرە مێژوو بۆ بەپەژموردەبوونی زەمەن دەمنووسێتەوە**

**لێرە زەمەن بۆ بەعەبەسیبوونی رەنگەکان دەمنووسێتەوە**

**لێرە رەنگەکان بۆ بەدۆزەخبوونی تەمەن دەمنووسێتەوە**

**لێرە تەمەن بۆ بەپاکیزەبوونی عەشق دەمنووسێتەوە .**

**لێرە شەوەکان و رۆژەکان و مێژووەکان و زەمەنەکان و رەنگەکان و**

**تەمەنەکان و عەشقەکان...هەر هەموویان دەمنووسنەوە**

**لێرە منیش بەتاقی تەنیٚ...**

**عەشقەکان و تەمەنەکان و رەنگەکان و زەمەنەکان و مێژووەکان و رۆژەکان**

**هەر هەموویان دەنووسمەوە**

**من لێرانە بەتاقی تەنیٚ / تەنهایی شەو دەنووسمەوە**

**بێدەنگی ئاو**

**نامۆیی ژوورێك**

**غوربەتی مانگ**

**حیلەی ئەسپێکی دابڕاو**

**لێوی بەهارێکی نەهاتوو**

**مەمکۆڵە پاییزییەکان...**

**لێرانە هەموو سوورەتەکانی مەرگ‌و هەموو گۆرانییەکانی دۆزەخ‌و هەموو**

**مۆمە رەنگاوڕەنگەکانی گوڵ‌و هەموو چیمەنە ئاوییەکانی شەونم...**

**دەیانەوێ بمنووسنەوە .**

**من لەنێو ئەم هەموو نووسینەوانەدا خەت خەتۆکە شڕوشیتاڵییە سیحراوییە**

**عیشقاوییەکەی سەر دیوارەکانی منداڵی خۆشم دەنووسمەوە .**

**(با) دەبا هەر تەنهاییم بنووسێتەوە**

**(با) دەبا هەر دوێنێم بنووسێتەوە**

**(با) دەبا هەر مردنەکانم بنووسێتەوە**

**چی دەبێت/ گەر ئەو شەوانەی بەماچ مێژوومان دەنووسییەوە**

**دووبارە بماننووسێتەوە**

**چی دەبێت/ گەر ئەو رۆژانەی بەڕووتی بارانمان دەنووسییەوە**

**دووبارە بینووسینەوە .**

**من لێرانە... لەدەرەوەی بازنە تاوسییەکانی راموسانیم**

**لەدەرەوەی جوگرافیا ئاونگییە تەڕ تەڕەکانی فیردەوسیم**

**لەدەرەوەی شەوە شین شینە شالورییە بەفریناوییەکانی ووجودم**

من لێرانە...

لەدەرەوەی کۆلآنە داخراوەکانی سەحەرە زەردەخەنەییەکانی پاییزم

رەنگە بلوێرێك لە رازە هەڵواسراوەکانم بۆت بنێرمەوە

تۆش لەنێو بازنەی بخووریترین شەوە سەرمەدییەکانم/ پێکێك لە بزە

سەهەندییە سەرمەدییەکانی ئایندەم هەڵدە/ ئەی رۆحی من

دەوەرە بم بەرەوە...

من گرێکم لەو پشکۆیەی ژێر ئاگردانی سەر سینگت رەنگی ستیانەکەت

دەمنووسێتەوە .

دەوەرە بم بەرەوە

من سەدەیەك/ لەمەمکە رێحانەییەکانی بەهارو

ئۆقیانووسێك لە شەپۆلم ژمارد

ئەی نامورادتر لەپێدەشتی لێوی کەمانجە شکاوەکەی (با)

ئەم خەمە تراویلکە ئاڵ ئاڵیە سەهۆڵیەت هەتا کەی..؟

ئەی بژوێنتر لە زەمەنە نەبژوێنییە پیڤۆکییەکانی هەناسەم

دەترسم منیش خەمە خومارییە خەواڵوەکانی خۆم

بۆ چاوەکانی ئەلیزایەکی تر بنووسمەوە

دەترسم منیش بۆ راشیلێکی تر گوێچکەی رازە کۆچەرییەکانم کون کون بکەم

پەریزاد (کچە شۆخێکی رۆژهەلأتییە...)

کە من لەبەشی دووەمی ئەم قەسیدەیە بەشای پەریان ناوم بردبوو:

لەنێو کۆشکێکی سپی کریستاڵی

نەسیمی شلێری شەوەکان

گەمە لەگەلْ پەردەی پەنجەرەکان و

تارا بووکێنییەکانی نێو دۆلأبە کراوەکان دەکات و ئەمیش خەون دەبینیٚ.

لە چۆڵەوانییەکانی نێو لەپی سەدە زیندەبەچاڵکراوەکان:

هەموو عاشقەکان لەسێدارە دەدرێن

کچۆڵەکانیش بەمەمکۆڵەکانیان هەڵدەواسرێن و تیرباران دەکرێن .

کۆمۆنارەکانی عەشق/

وەکو تاشەبەردی

کەڤالێکی سەهۆلأویی نم نم بەنێو رەگە عاتیفەییەکانی

زەمەن دەتوێنەوە

وەرزەکان لەنێو شەقامەکانی سەرگۆنای گەورەکچان گۆرانی بۆ

مردنەکانیان دەڵێن .

کۆمۆنارەکانی عەشق /

بەبەرگێکی سپی سپی لەدەوری مەشخەڵێکی گەش بازنەیان بەستوووەو زیکر دەکەن .

گەڵاکان هەڵدەوەرن ئەمانیش هەر زیکر دەکەن .

باڵندەکان سەرخۆش دەبن ئەمانیش هەر زیکر دەکەن .

گەردەلوول و زریان هەڵدەکات ئەمانیش هەر زیکر دەکەن .

کۆمۆنارەکان دەچنە نێو ئاگرەکەو دەسووتێن و هەر زیکر دەکەن ...

هەر دەسووتێن و هەر زیکر دەکەن ...

کۆمۆنارەکان هەر زیکر دەکەن و هەر دەسووتێن .

هەر دەسووتێن و هەر زیکر دەکەن .

هەتا دەبنە رووبارێکی سپی سپی خۆڵەمێشی..!

گەڵاکان دەوەرن نم نم دەوەرن

گەڵا گەڵا سەرمەستانە دەوەرن

میلی کاتژمێرەکان بەپێچەوانەوە دەسوورِێن / بارانیش بەپێچەوانەوە لەزەوییەوە بۆ ئاسمان بەرزدەبێتەوە .

كۆمۆنارەكان هەر دەڕۆن‌و هەر دێنەوە .

هەر دێنەوە/ بەبەرگێكی دڕاوەوە

سورەتی عەشقیان بەسەر سینگە رووتەكانیان هەڵواسیوە

هەر دێنەوە خۆیان‌و كۆڵێك خەونی سپی سپی

لەدەوری كۆشكە ئەفسانەییەكەی شای پەریان بازنەیان بەستەوە .

بەم گۆرانییە زیكرە عاشقانەكەی خۆیان دابەستایەوە

( شەو لە تەمەنی ئێمە لەبەهارێكی رووزەرد دەچێ

بەهار لەتەمەنی ئێمە لە سەحەرێكی تاریك دەچێ

سەحەر لەتەمەنی ئێمە لەمەمكۆڵەی كچێكی تەنیا دەچێ

عەشق لەتەمەنی ئێمە لەفیردەوسێكی ئاویی دەچێ )

كۆمۆنارەكان یەك لەدوای یەك بەڕیز لەشای پەریان چوونەژوورەوە

لەدەوری چوارپایەكەی هەم دیسان زیكرەكەیان دەست پێكردەوە

پەنجەكانی خۆیان داگیرساند :

سەر سینگیان مەشخەڵێك بوو لە ئاگر

لەسەر گۆناكانیان گۆڕستانێكی تاریك تاریك

لەنێو چاوەكانیشیان جەستەیەكی خەڵووزاوی دەبینرا .

بەم گۆرانییە شای پەریان لەسەر دەستەكانیان هەڵدەپەڕاند

( ئێمە بەختەوەرترین شەونمە سپیەکانی عەشقین

ئاگر پێکهاتەیەکە لەئێمەو ئێمەش جەستەیەکین لەئاگر

ئێمە خۆمان بەتریفە باراناوییە تەم تەماوییەکەی بەفر سپاردووە

شادومانیترین لە ماسیەکانی نێو رووبارەکانی گیا...)

کۆمۆنارەکان خەناوکەیەك لە سورەتی گۆرانییەکانی عەشقیان

پێشکەش بەشای پەریان کرد

دوای ئەوە بوون بەتابلۆیەکی سەر دیوار

گوڵدانێكو دەسکەگوڵێکی زەردو سوورو سپی...!

گوڵەکان زیکریان دەکردو گەڵاکانیش ئەم گۆرانییەیان دەگوتەوە :

(ئێمە هەناسەی رەنگە جوانە ئیرۆسییەکانین

ئاڵ ئاڵیترین لە بەهار

ئێمە شەپۆلمان بەرووبارو هەناسەمان بەسرووشت بەخشی

ئێمە بەفرمان فێرە سەماو رووناکیمان فێرە عەشق کرد

ئێمە بەرائەتمان بەمنداڵی بەخشی و خۆشمان مردین...)

دەبا هەڵبکا ئەو رەشەبایەی زیندەگی و مەرگی بەیەك ئاشناکرد

دەبا رۆندکەکانی خەونە عەبەسییەکان

لەنێو دەمارە حەژمەتییەکان مۆمیا بکەین .

چ سەفەرێکی سەخیفە ئەم وجوودە

**چ ڕۆژێکی بەفرینییە ئەم خەوە خامۆشە**

**ئاڵتوونیترین ڕۆژەکانمان بەڕێ کرد شەوگاریترین سەدەکانمان**

**زیندەبەچاڵ کرد**

**خۆمان بەمەعبەدی عەشق بەخشی و ئاخیرەتمان**

**هەر خۆکوشتنە...!**

**لەخەو رادەچلەکێ...**

**هەموو گیانی لەشەونم هەڵکێشراوە پارچەیەکە لەوەنەوشە**

**رادەچلەکێ /**

**بەکتێب و سوورەتەکانی عەشق خەونەکەی ڕاڤەدەکا**

**ملوانکەی گەردنی دەپسێنێ**

**ڕەنگە جیوەییەکان لەدەنکە مۆرەکان جیادەکاتەوە**

**ڕەنگەکان ریزدەکات و ئەم رستەیە دەخوێنێتەوە**

**(عەشق گەورەترە لەمردن ئاخیرەتیشمان هەر خۆکوشتنە)**

**رادەچڵەکێ /**

**ڕێژنە بارانی تەرزە گیانی دەکاتە دوورگەی بەستەڵەك**

**لێوی یادو ئومێدەکانی دەکرۆژێ**

**لەئاقاری زەمەن دەچێتەدەر**

دوای چەند وەرزێك لەگریان و بیرکردنەوە

رۆندك رۆندك بزە دەگەڕێتەوە سەر سیمای و

بۆ کۆمۆنارەکان دەدوێ:

چاوەڕوانم بن / منیش لەجنسی ئێوەم بەرەو لاتان دێم

بمکەن بە بووکی نێو کۆشکی دڵتان

چاوەڕوانم بن بەرەو لاتان دێم/

بم بەنەوە بەر ئەو پەنجەرە گەورەیەی لەتارا سپییەکەی

ئەوێندەرم هەڵکێشن

دەبا بینۆشین ئەو شەرابەی کە زیندەگیمان بەچراخانی مەرگ دەبەخشی

دەبا بینۆشین/

ئەو شەڕابەی کە جەستەمان لە روناکی شەو دەتوێنێتەوە

تۆش... تۆش

(پاش هەڵدانی شەرابی مەرگ و چوونە ژووانی مردن

لەدوا چرکەکانی سەرەمەرگ

تەنها بەفریای ئەم چەند وشەیە دەکەوێ...)

ماڵئاوا/

ئەی فێنکتر لەئێوارە نەسیمییەکانی رۆحی بەهاریم

نەم دەویست بەجێت بهێڵم

ئەی کوڕە جوانە ڕۆژهەڵاتییەکەی ئەڤینم

ئەی ئومێدی هەموو خەونە گەورەکانم

ئەی بارانتر لەو زەمەنە باراناوییەی

کە خەونە کابووسییەکانی نێو خەوە تاریکییەکانی دوێنێمت ڕەواندەوەو

بەجوانی شەوو بەعەشقگەی مانگت ئاشناکردم

ئێستاش سەروەرترم لە ڕووبار

چونکە من خاوەنی عەشقێکم دڵبەخشندەتر لەوجوود

ماڵئاوا ئەی هەناسەم /

دەمویست بەجێت نەهێڵم و منیش

هەموو ژیانم بەو عەشقە مەزنەم ببەخشم...!

ئیدی من لەکەنار دەریای چ زەمەنێکم

سواری فەرشە ماچیکیەکەی چ ئایندەیەك بوویمە

ئەی پاکیزە

نهێنی لەنجەو گەمە بەردەوامەکانی ئاو منیان گەیاندە ئێرە

من لێرانە بەخەون بینینێك شاگەشکەدەبم

هەموو برینەکانی جەستەم بۆت هاواردەکات

چاوەڕانم بە ئەی رۆحی من
وەرە بەفریای ئەم رۆحە هەلاهەلایەم بکەوەو بم بەرەوە
بم بەرەوەو بەبینینت خەون دەبینم
ئەی شەنگەبیە شەوبۆیەکەی شەوە مەست مەستەکانم
لەم تەنهاییە کریستاڵیەم گۆرانییە باڵندەییەکان رام دەژەنن/
تریفەیەکی نارنجی شەوانان حیکایەت بۆ ئایندەم دەڵێ
وێنەی تۆم لەجەستەی با هەڵکێشاوە
هەموو بەیانیان گەزنگی سەحەر رووتم دەکاتەوە
وەك وێنە ئایندەییەکانت رووت رووت...!

ئەی پاکیزە
ئێستا دەبێ لەهەوارگەی چ کات ژمێرێك
رەشماڵی خۆت لێ هەڵدابێت و چرکەکانی گەردنت بۆ هاتنەوەمان بژمێری
ئێستا دەبێ لەپێشوازیم چ سەوزاییەکت بەسروشتەکەی
لای خۆتان بەخشیبێ.
چ ئاوازێکت بۆ گۆرانییە خامۆشەکانی شەو دانابێ
ئیدی پەریان چ سەمایەکم لەپێش دا بکەن
دەترسم لەم بیابانی تەمەنە و بەم برینە گەورانەوە

**نەگەمەوە سەر کاریزە سازگارەکانی رۆحی تۆ**

**گوڵەباخ / ئەی ئومێدە خۆرەتاوییەکانی من**

**ئێستا لەلام بویتایە برینەکانی دڵتم بەڕازە وەنەوشەییە**

**سەحەرییەکانم دەپێچایەوەو**

**تینوێتی جەستەو مەمکۆڵەکانیشتم بەفرمێسکی گۆنای غەریبیتم**

**دەشکاند .**

**ئای ئەگەر دەمزانی**

**((ئاخیرەتمان هەر خۆکوشتنە))**

**هەرگیز لەهەوارگە تەنهاییەکانی رۆح و میحنەتەکانی جەستە بەجێم نەدەهێشتی**

**هەرگیز نەم دەهێشت لەنێو بەلەمەکانی گەردەلوول**

**شەوانان خۆت بەکەزیەکانی ئەستێران شۆڕبکەیتەوە**

**ئیدی ئەمە قەدەرەو ئێستا لاوکە گەرمەکانی غوربەتم**

**نم نمو تنۆك تنۆك خوێنیان لێ دەچۆڕێ**

**کوان ئەو پەنجەرانەی لە زەمەنە ئاگراوییەکانمان**

**ماچیان لەگەردنی ئایندەمان دەکرد...؟**

**من لێرانە بەتاقی تەنێ لەگەمەی شەپۆلەکانی رووبارو**

لەپیاسەی نێو شەقامەکانی باران بێزاربووم

من لێرانە بەتاقی تەنێ لە خەونەکانی ئاگر مەستترو سەرخۆشترم

من لێرانە لەنێو تریفەی چاوەڕوانی .

جگە لەخەون و خەیاڵەکانی تۆ دڵم بەچیتر خۆش نابێت .

خۆزگە منیش ماڵێکم لەئاسمان هەبووایەو

یەکێکیش لەکەنار رووباری فرمێسکەکانی تۆ

خۆزگە منیش باخچەیەکم لەقووڵایی دەریا هەبووایەو

یەکێکیش لەبنار مەمکۆڵە سپییەکانی تۆ .

ئای خۆزگە منیش دەگەڕامەوە نێو ئەو شەوانەی

کە ملوانکە پەلکەزێڕینەییەکانی زەردەخەنەتم لەگەردنی

پەیکەرەکانی شیعر دەکردو

خۆم دەدایە بەرڕێژنەی بارانەکانی نەمری .

ئای خۆزگە دەگەڕامەوە نێو هەناسەی ئەو ئێوارانەی

کە لەنێو پارکەکانی پەلکەزێڕینە پیاسەمان دەکردو دڵە ماندووەکانی

باڵندەکانیشمان ئارام دەکردەوە .

دەوەرە ئەی رۆحی من

رامهەژێنەوە بەبرینەکانی ئەو گەلاَیانەی

کە سەحەرو وجوودو زەمەن‌و وەرزەکان‌و شیعرو عەشق
لەنێو پێکە شەرابەکانی دا خەوتوون
چی دەبێت/ گەر بۆ تەنها جارێکی‌تر
بەتەنهایيە ئەسمەرییەکانی شەوو بەپەلکەزێڕینەی خەزێمە

جوانەکانی ئومێدو بەڕەنگاڵەیی وەرزەکانی عەشق/ رامهەژێنییەوە
دەوەرەوەو بم بەرەوە
وا بەتاقی تەنیٚ شەق دەبەم شەق
لەم خۆرستانی رۆژو لەم تەم تەمستانی شەوەدا
بارانی میحنەتیش وا
نم نمو دڵۆپ دڵۆپ دا دەچۆڕێتە نێو درزی خاکە خەماوییەکانی
هەوارگە رەشۆکییەکانی دڵم
ئای چ رەشبەڵەکێکی مردن لەتابووتی خەونەکانم دەخوێنمەوە
چ خوناوێك لەسەر گەڵا زەردەکانی جەستەم
شەقامە سوورەکانی ئایندەی ئەم عەشقە مەزنەم دەنێژیٚ
ئەمە قەدەری عەشقی منە
دەبیٚ ئایندەو مێژووو مرۆڤایەتی چی بڵێن...؟

گەر من لەو ڕەهێڵەی دڵشکان و خۆکوشتنە
لەم دوورگەی دڕکەلووکە بیابانیە بەتۆ نەگەمەوە
ئای چ قەدەرێکە

بەجەستەی پڕ لە برینمەوە
بەخەیاڵە ڕەشە مەرگاوییەکانمەوە
ئەگەر منت نەبینیەوە بڕۆ لێوی دارسنەوبەرەکان بپشکنە
نامەکانم , شیعرەکانم ، پێشنیهادەکانم
لەوێندەرێ بۆت بەجێ دەهێڵم
ئەگەر منت نەبینیەوە /
بڕۆ هەوارگەی خۆت لەنێو مەمکۆڵەی شەپۆلەکانی ڕووبار هەڵدە
لەوێندەرێ /
لەبن پنجەگیایەکان و لەسەر گۆنای پەڕە گوڵەکانی یادەکانم
شیعرەکانم/ بەسەرهاتی شەوێك لەشەوە گەرمەکانی
وەرزی توانەوەمان بۆت دەنووسمەوە
ئەوە منم/
لەنێو ڕۆشنایی شەقامە ماندووە بێدارەکانی ئەستێرەکان و
لەنێو ئارامی کۆڵانە بێ دەنگەکانی بارانەوە ڕاکشاوم

**دەستت بێنەو بم بەرەوە...**

**من کوشتەو تامەزرۆی ئەو رۆژگارانەم**

**کە زەمەن گەمەی لەگەڵ پیتە رەنگەکانی خەونەکانمان دەکرد**

**لە گۆشە نارنجییەکانی عەشق**

**بەمۆسیقا ئارامییەکان دەیلاواندینەوە .**

**دەستت بێنە/ گەر ئەمجارەیان بەیەك بگەینەوە**

**لەبەردەم پەنجەرەیەکی ئاوی لەتارایەکی سپی سپیت**

**هەڵدەکێشم .**

**هەموو شەوێ تا بەیانی .**

**بەدیار جوانی و شۆخ و شەنگیت سەمایەکی گیاییت بۆ دەکەم**

**کتێبی/**

**شەوەکان و**

**وەرزەکان و**

**رۆژەکان و**

**یادەکانمان بەماچ هەڵدەدەینەوە ... !**

**چیرۆکی ئەفسوونییە سێکاساوییەکانمان بەبزەی مانگ دەنووسینەوە**

**ئاخ بەس ئەمجارە بەیەك بگەینەوە**

رازە نەورەسییەکانت لەڤینۆسی ئاو هەڵدەکێشم

پەیامی ئەو عەشقە مەزنەمان لەگەڵ باران و تریفەی مانگ
بۆ هەموو/
هەوارگەیەك و مەملەکەتێك و دوورگەیەك و ئۆقیانووسێك
دەنێرم .
لەبەردەم پەنجەرەی هەر ماڵێك و لەنزیك هێلانەی
هەر باڵندەیەك بخوورێك لەجوانیت هەڵدەکەم
پەیکەرێکی باڵات لەسووری و خامۆشی شەوە گەرمەکان دەتاشم
ئەی پەروانەی ئەو عەشقەی کە ئایندە ،
لەناو بێشکەی بەختەوەری راتدەژەنێ
دەزانم ئێمە دەمرین و ئاخیرەتمان هەر خۆکوشتنە...!
بەلاّم عەشق/
هەر سەروەرترو سەروەرتر سەروەرتر دەمێنێتەوە
دە دەستت بێنە و بم بەرەوە / دەی دەی دەی
دەی پاکیزە گیان دەدەستت بێنە و بم بەرەوە دەی ... !

ئۆکتۆبەری 2000 / کەنەدا